ئیسماعیل ئەیوبی

# زبانی ئاڤێستا

سەرچاوەی زمانی سانسکریت و ڕێگ ڤیدا و کوردی ئەمڕۆ



هەولێر ٢٠١٢

# زبانی

# ئاڤێستا

## سەرچاوەی زمانی سانسکریت
## و
## ڕێگ ڤێدا وە کوردی ئەمڕۆ

لە نووسینی

ئیسماعیل ئەیوبی

وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

ناوی کتێب: زبانی ئاڤێستا سەرچاوەی زمانی سانسکریت و رێگ ڤێداوە کوردی ئەمڕۆ
نووسینی: ئیسماعیل ئەیوبی
پیتچنین و نەخشەسازی ناوەڕۆك: گۆران
نەخشەسازی بەرگ: ئامانج ئەمین
چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆشنبیری – هەولێر/ ٢٠١٢

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٥٥١) ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە

## بەقەڵەمی نووسەر

ناوم ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم، ناز ناوم سمکۆ ئەپڕام، لە بەفرانباری ساڵی ١٣١٩ کۆچی خۆری لە ئاواییە چکۆلانەکەی بە کێوان دەورگیراوی قەڵاگای گرگر، ناوچەی گاوەڕۆی کامیاران لە دایک بوومە وە لە تەمەنی نزیکەی دە ساڵیدا لە قوتابخانەی ئاوایی خۆمان لە لای ئامیرزای ئاواییەکەمان دەستم کرد بە خوێندنی قورئانی پیرۆز ئەوکات زستان بوو، بەفر و بۆران بوو کاتی بێکاری یا کەم کاری کرێکارانی لادێکان بوو، تا کاتی کاری بەرخ و کارژەلە لەوەڕاندن هات قورئانم تەواو کرد و ئەو زستانە ساڵی ١٣٢٩ کۆچی خۆری بوو، دوای ئەوە کە بەهاری ساڵی ١٣٣٠ ک. خ هات و هەموو کاری کشت و کاڵ و ئەوەی کە ووتم سەری هەڵدا منیش تەنیا کوڕی گەورەی بنەماڵەم بووم، دەستم کرد بە ئیش و کاری جوراوجۆر و خوێندن راوێستا و قورئانی پیرۆزیش کەوتە کەل کەنو، لە ماڵی پڕ لە دوکەڵ و بنمیچ پڕ لە دورنج، وەکوو هۆشەڵەی تری رەشە بەڵام تاڵ وەکوو ژارماری، خەلە و خەرمان تەواو بوو لە دەستی گایشێت و چانی دارین نەجاتم بوو؛ ئەمجار کە بەفر باری دیسانەوە لە لای ئامیرزای دێکە کە دەبوایا رۆژانە هێلکە یا کەرەم بۆ ببردبایە

دەستم کرد بە خوێندنی قورئانی پیرۆز[١] و کتێبە فارسیە و کوردیەکان کە هەموو داستان بوون و بەڵام فارسیەکە کلاسی هەوەڵ بوو و ئامیرزا خەتی رقومیشی پێ دەوتین، بۆ سیاهە (یانێ نووسینی قەرز و قۆڵە لە نێو دەفتەرێکدا) زستانی ئەم ساڵەش تەواو بوو، دیسانەوە کاری کشت و کاڵ و مەینەت و زەحمەت کێشان سەری هەڵدا و بەرهەمی بۆ دەرەبەگ و گزیر و زاووت و کوێخا و کوڵە فیتنەی، لادێ بوو، هەر جۆرێک بوو خەلەو خەرمانی ساڵی ١٣٣١ی کۆچی خۆریش تەواو بوو، ئەمجار چوومە خزمەتی مامۆستای بەرێز، خوالێ خۆش بوو، مەلا عەبدوللا ئەیوبی و قوتابیە ئەرشەدەکانی لە ئاواییکی دیکەو بە هێنانی ئارد و قاورمەی زستانی و دانەوێلە و برۆش و دوێنە و شێلم و شتانی دیکە لە ماڵی خزمێکماندا لەو ئاواییەدا مامەوە لەوێدا چەندین کتێبی سەرەتایی ئەدەبیاتی عارەب و علوم دینیم خوێند و لە دوایی لە لای چەند مامۆستای ئایینی ناوچەکە هەرچەند زانستیان زۆر نەبوو خوێندمە، دوای چەند ساڵ لە لای مامۆستای ئایینی ئاوایی نیەر بە ناوی بەرێز مەلا ئەمینی مینبەری فەلسەفە و زانستیەکانی دیکە وەکوو مەنتیق و فقهم خوێندوە و زۆر کەڵکم لێ وەرگرتوە لە دواییدا چومەتە شارۆچکەی تەوێلی کوردستانی باشوور لە خزمەتی خوالێ خۆش بوو مەلا ساحیبی تەوێڵەیی کە رێزی زۆرم بۆی هەبوە و هەیە خوێندومە و دوای ئەو چەند مانگ چومەتە خزمەتی مەلا عەبدوڵای گوڵپی لە ئاوایی دێ کۆن، لە شارە زوور لە کوردستانی باشوور، لەوێدا لە ماڵی خوا لێخۆش بوو حاجی موحەممەدی سالح و دایە خالی خێزانی بووم کە هەزاران رەحمەت دەنێرم بۆ گۆڕی پاکیان کە

١. بۆ ئەوەی رەش خوێنی قورئانی پیرۆزم لە بیر کردبوو و باشم نەدەزانی لە کاتی خوێندنی ئەلف و بێ و قورئان و کتێبی کوردی و فارسی نیزیکەی ٥ ئامیرزا قوتابخانە گۆڕدرا و لە خودی دێیەکەماندا خوێندەواری نەبوو، ئەو ئامیرزایانە هەموو لە دێهاتی دیکە بوون.

ئەو کات کوڕێکی خەباتکاریان هەبوو بە ناوی خالید کە لە دواییدا لە شەڕی بەعسیەکاندا لە شاخی بەرزی پشتی زەڵمدا شەهید بوو سڵاو لە گۆڕی پاکی، لە دواییدا چوومەتە شارۆچکەی سورداش کە ماوەییکی زۆر لە خزمەتی مامۆستای ئایینی زۆر زانا و بەڕێز و بە بیر و باوەڕ مەلا عەبدوالرحمان بانەیی بوومە و بۆ ماوەیکیش لە کەرکووک و ناوچەی سلێمانی خوێندومە تا ئەوەی لە ساڵی ١٣٧٩ کۆچی بەرامبەر بە ١٣٣٦ی کۆچی خۆری یانێ لە تەمەنی ١٧ ساڵەییدا دوای تەواو کردنی هەموو زانستیەکانی فورمی ١٢ یانی صرف و نحو، فقه، حدیث و تفسیر و منطق و کلام و فلسفه و بیان بلاغە و بدیع، و اصول الفقه بە بەشداری خەڵکی شارۆچکەی سورداش و مەقاماتی حکومەتی ئەو شارە لە جێژنێکی شکۆداردا لە خزمەتی مامۆستای زانا و بەڕێز و پەرهێزکار جەنابی خوا لێ خۆش بوو مەلا عەبدوالرەحمان بانەئی مەزریلانی ئیزنی فتوادانم لە فقهی شافعی و وانە و وتنەوە و بڵاوکردنەوەی علومی پەیوەندار دا وەرگرت، دوای ماوەیکتر لە خزمەتی قازی عەلی مامۆستای بەڕێز لە سەردەشت و هەر وەها لە سنە لە لای زۆربەی مامۆستایانی ئایینی شاری سنە کەڵکم وەرگرتوە و لە گەڵ هەمووان لە زانستیەکانی عارەبی باسم کردووە و لە مەکتەبی علوم دینی سنەش‌دا وانەم خوێندووەو دیسانەوە لە شاری کرماشان خوێندنی سەرەتاییم لە قوتابخانە حکومەتی دا تەواو کردوە و لە ساڵی ١٣٤٠ی کۆچی خۆری لە تاران گواهی نامەی مدرسی ریسی علوم مەنقولم کە موعادیلی دیپلومە گرتوە وە لە ساڵی ١٣٤٩ کۆچی خۆری گواهی نامە پایانی تەحصیلات دبیرستان (دیپلۆمی ئەدەبی) وە دیسانەوە لەم ساڵەدا ئیجازەی فتوادانم لە فقهی شافعی و وانە و وتنەوەی علومی پێوەندار و بڵاو کردنەوەیان دا لە حاکم شەرعی فورمی و موفتی کوردستان خوا لێ خۆش بوو مامۆستا حاج مەلا خالید موفتی و حاج محمد شیخ‌الاسلام مامۆستای زانکۆی مەعقول و مەنقولی تاران گرتوە

و له ٤٩/٦/٢٢ ی ک. خ هەر ئەو ساڵە ئیجازە فتوام له وەزارەتی پەروەردە و بارهێنانی ئێران له سەردەمی وەزارەتی خانم فرخ رووی پارسا ژنی بە ئەمەگ و راستگو و خوالیخۆش بوو بە تەئیدی علمای اهل تشیع و بریکاری وەزیر، خوالیخۆش بوو باهنر گرتوە کە ئەم مولەتەموعادیلی لیسانسی حقوقه وه ئەوەش بڵێم کە له سالی ١٣٤١ ک. خ دا چومەتە زانستگەی علومی معقول و منقولی تاران بەڵام له بەرچەند هۆیەک درێژەم بە خوێندن نەداوە، له ئاکامدا له سالی ١٣٥٠ ک. خ دیسانەوە رۆیشتومەتە زانستگای تاران و له زانستگەی علومی ئیجتماعی و تعاوون (زانستیەکانی کۆمەڵایەتی و هەمیاری و هەمکاری) له ساڵانی ٥٣ - ٥٢ و ٥٤ - ٥٣ له نێوانی قوتابیانی ساڵی ١٣٥٠ ک. خ ئەو زانستگەی‌یەدا پلەی هەودلم هێناوە و لە مانگی جۆزەردانی ١٣٥٤ ک.خ لیسانسم له ریسی زانستیەکانی کۆمەڵایەتی له زانستگای تاران به پلەی ئەلیف گرتوەوە، تێزەکەم بە ناوی جامعە- شناسی آموزشی بە زبانی فارسی چاپ کراوە، کە ئەم پەرتوکە توێژیکی ئەکادیمیانەیە له مەڕ خوێندنەکانی له مێژینه له شاری سنەو ئاوای ئارەنان و هۆکارەکانی پەرەسەندنی طریقەکانی (تەریقە = رێگا) نەقشبەندیە و قادریە لە کوردستاندا و شێودی خوێندنی لە مێژینەم لەو دو جێگایەدا وە لە هەمان کاتدا ئیزنی چاپی کتێبی (رویا پدیدە اجتماعی) له مەڕ خەو دیتن کە خۆم توێژ و تاقیقم کردوە لە ژمارەیکی بەرچاو لە خەڵکی شاری سنە و لادیەکانی بە چین و توێژەکانی و بە کار و شوغلی جۆراوجۆر و کاریگەری ئایین و مەزهەب و شوغل و ... لە سەر خەو دیتن وە لە کاتی خوێندن لە زانستگای تاران دا چەندین کونفرانسم (لە بارەی بیر و رای گشتی لە ئێراندا بە هەڵسەنگاندن لە گەڵ کتێبی ئالفرید سوی و بیر و رای گشتی لە فەرانسە و فەرەوانی گەل لە جیهانی سیوم و رەخنە لە کتێبی پروفیسور شەیباچەترچی و کۆمەڵ ناسی لە جیهانی سیوم و تەفسیر

دەئایات لە قورئانی پیرۆز پیوەند لە گەڵ علوم زیست ناسی (ژین ناسی) وە رەوان ناسی و کۆمەڵناسی، مەردم ناسی بە ئامادەبوونی مامۆستایانی زانکۆ و قوتابیانی ئەو زانکۆیە داوە و نووسیومەوە هەر وەها لە بارەی ئاست و میزانی سەواد و خوێندن لەو وڵاتانی جیهانی سیوم و هەڵسەنگاندن لە تەک وڵاتانی پێشکەوتوو دا نامیلکەیەکەم نووسیوە و ٣٦٠٠ (سێ هەزار و شەشەد) لاپەڕەم لە راڤە و تەفسیری شانامەی فیردەوسی‌دا نووسیوە کە لە شۆڕشە کە دا دو هەزار لاپەڕەی نەماوە و ئێستا ١٦٠٠ لاپەڕەی ماوە کە هەموو ئەو چەند هەزار لاپەڕەی راڤەی شانامەلە ساڵانی ٥٥ و ٥٦ ی ک . خ و بڕێک لە ساڵی ٥٧ لە رادیوی سنەدا بڵاو کراوەتەوە و لەو راڤە دا قارەمانانی شانامە لە گەڵ هێرکوڵ قارەمانی هومێری یونانی، روستەم و زۆراو زاڵ و سیمورغ، کەیکاووس و سودابە و سیاوەش لە گەڵ لی چینگ و نوچاوە خییانەتی سوتاکی بەشوەکەی بە ناوی چاو و وانگ وە حەزی ئەو لە بینی کیای کوڕی چاووانگ لە چین، وەکوو سودابە و کەیکاووس و سیاوەش لە شانامەدا هەر وەها فلیکان لە چین وەکوو ئەکوانی دیو لە ئێراندا وە هەڵسەنگاندنی چۆنیەتی پەروەردی زاڵ لە گەڵ شکەن تەڵا لە هیند و هاکی لە چین‌دا بۆ هەموو ئەو ووتانە کە نووسیومە بەڵگەی فورمی و راستەقینەم لە بەردەستدایە وە زیاتر لە ٣٢ پەرتوک و نامیلکەم نووسیوە کە نیزیکەی چوار تا پینجیان چاپ کراوە و سیان لەوانیش وا لە نەوبەتی چاپدا کە ئەگەر بەم زوانەم نەمردم هەموویان چاپ دەکەم ئەم نامیلکەیەم بە ناوی ئاڤێستا سەرچاوە ریگ ڤیدا و زبانی کوردی ئەمڕۆ ناوم ناوە، هومێدم وایە جێگای پەسەندی زانایان و خوێندەوارانی گەلەکەمان بێ و بە گەورەیی خۆیان لێم ببورن چونکو هەر ئەوەم زانی و دەرفەتم بوو خستمە بەرچاو، تکایە بۆ راست کردنەوەی هەڵەکانم بە ناونیشانی سنە (سنندج) شەقامی ئاوییەر (خیابان آبیدر) کۆڵانی گوڵستان

(کوچە گلستان) ژمارەی خانو ٣٨ و ٤٢ نووسینگەی خۆم (پلاک ٣٨ مترل و ٤٢ دفتر اسماعیل ایوبی) بۆ بنێرن. ئیتر بژین بە شادی و سەربەرزی.

نیسماعیل ئەیوبی (سمکۆ ئەپرام)

# هۆمەتە، هۆرەختە، هۆرشتە

## بیری چاك، ووتاری چاك، کردوەی چاك

## سەرەتا:

بە ناوی ئاهورامەزدای پاك دەنووسم، ووشەکانی ئاڤێستا بە بیر و وتار و کردەوەی چاك، سینەی دوژمنی نەزان دەکەم چاك چاك، هەر پێ نووسە دەبێتە هۆی رزگاری هەموو ئاو و خاك، داودرن بەهێز بن کوردانی چالاك.

زبانی ئاڤێستا (ئاوێستا) سەرچاوەی نووسراوەی زبانی کوردی و سەرچاوەی ریگ ڤیدا و زبانی سانسکریت هەر دوو، رووداوی زانای هێندی و گوشتاسب شا و زەردەشت و کایەی شەترەنج لە زەردەشت یا برزویەی پزیشك.

دوای تێ ڕوانین بە کتێبەکانی مەزد یەسنا و نووسینی هەورد تەرەشقەی ١ و ٢ لە وەڵامی دوکتور نوشیدەری دا و ئاڤێستا (ئاوێستا) کۆنترین نووسراوەی ئێرانی لەمێژینە لە وەرگێڕان و توێژی جەنابی هاشم رضی و تێ ڕوانین بە کتێبی بە شهر رۆشن زرتشت لە نووسینی دوکتور حسین و حیدی و کتێبی چنین گفت زردشت لە کۆ کردنەوە و تالیفی فردریك ویلهلم نیچەی ئاڵمانی لە وەرگێڕانی حەمید نێیر نوری و تاریخ ادبیات عصر ئاوێستایی لە نووسینی پروفیسور عباس مهرین شوشتری و چەند کتێبیتر لەم بابەتەوە، هاتمە سەر ئەوەی کە نامیلکەیێك، سەبارەت بە ریشە و بناغەی باوی زبانی کوردی کە لە زبانی ئاڤێستایی نووسراوە، هەڵقولاوە و تەنانەت بڵێم زبانی سانسکریت و کتێبی ریگ ڤێداش سەرچاوەی لە لای زەردەشتە و بەڵگەی ئەم ووتەم ووتاری نووسراوەی ئیدموند بورد و زیکلی *Edmond Boraeau xszekely* مامۆستای زانکۆی کالیفورنیایە کە لە بابەت ئاڤێستا و زەردەشت بیر و را و چەمکی تازەی هەیە کە شەش جلد کتێبی بە ناوی *Theworld pictureof zrathushtra* کە لە ساڵی ١٩٥٣ی ز لە ئەمریکا دا چاپ بوە نووسیویەتی کە چینگرەنگها چە *(Chengrnghaca)* زانای گەورەی هیندی دوای ساڵێك کە لە گەڵ ویشتاسب شادا لە لای مامۆستای گەورە زەردەشت وانەیان لە باخی زەردەشتدا خوێندوە فیلسوف و زانای هیندی گەڕایەوە بۆ هیندوستان و کورتەی ئەو وانانەی کە لە مەحزەری زەردەشتدا فێر ببوو بە شێوازی سرودگەلێ زۆر جوان و

قولّ بە ناوی ریّگ ڤیّدا (ریّك ویّدا) بنووسیّ کە بە یەکیّ لە گەورەترین کتێبانی موقەددەس و پیرۆزی رۆژ هەلاّت دەژمیّرری کە بە هۆی ئەم رووداوە، پیّك‌هیّنەری ئەسلّی ریّگ ڤیّداش زەردەشتە کە ئەم باسە لە کتێبی ئاڤیّستا لە وەرگیّرانی وتویّژی هاشمی رضی لاپەرەی ٨٧ تا ٩٦ی ئەم کتیّبە هاتوە کە لە دوایی ئەم نامیلکەدا روداوە کە بە کوردی وەردەگیّرم و دەینووسم، لەم روداوەدا، وا دەگەیّنیّ کە زەردەشت وەکوو پیامیەرانی رۆژ هەلاّت زۆر بە زانستی و شیّوازی پیتۆلّی دواوە و بابەتەکەی بە راستی بە شیّوەی زانستی و دوور لە خەیالّ و گومان شی کردۆتەوە.

فەرهەنگ و شارسانیەتی ولاّتی کوردەواری لەو کاتەدا بە لوتکەی بەرزی زانستی گەیاندوە کە لەم نامیلکەدا زیاتر لە چوار سەد ووشە، سەبارەت بە هەموو بابەتەکان لە کشت و کالّ و ئاژالّ داری و ژیان ناسی و گیان لەبەران و کییایەکان بگرە تا زۆربەی بابەتەکان و ناوی ئامرازە پزیشکیەکان و ووشەکانی ئابووری و کۆمەلاّیەتی و رامیاری و ناوی بیماریەکان کە لە فەرهەنگی ئاویّستایی دا هەیە کە زۆربەی ئەم ووشانەم لە تاریخ و ادبیات عصر ئاویّستایی نووسراوەی پرافیسور عباس مهرین شوشتری گرتوە کە هەزاران درودی پڕ لە جوانی و لە ناخی دەرونەوە پێشکەشی دەکەم، هەر چەند ناویّکی لە کورد نەبردوە کە ئەو هەموو زەحمەتەی بۆ ژیانەوەی فەرهەنگی ئاڤیّستایی کیّشاوە، ویلهام نیچەی ئالّمانی کە خۆی لە پیّشان جو بووەوە بوەتە فەلە، لە دوایدا ئایینی

زەردەشت هەڵدەبژێرێ و ئەڵێ زەردەشت لە نێو پەیامبەراندا بە تێکڕایی لە هەموویان راست گۆترە، هەر چەند زەردەشت دوچاری گەورەترین هەڵە بوە کە ئەخلاقی پێك هێناوە، بەم جۆرە ئەبێ ئەو هەودڵێن کەسێك بێ کە بە هەڵەکەی خۆی بزانێ، بۆ ئەوەی ئەو لەم باردوە لە هەموو بیرمەندان ئەزمون و تەجرەبەی زۆرترە (وە مێژوو، شتێك جگە لە رەدی ئەزمونی فەرزیەی بە ناو بانگ: ئەزمی ئەخلاقی لە هەموو شتاندا نیە) و زەردەشت لە هەموو بیرمەندان و موتەففەکێران راستترە، نیچە، هەموو ئەو ئەرز شانەی کە لە درێژایی سەدەکاندا پیرۆز و موقەددەس دەژمێرران ئینکاری کردوە کە وولتێر ئەگەر لە هێرش بۆ سەر مەسیحیت تەنیا توانی تەشریفات و داب و نەریتە دانراوە بچوکەکانی ئەوان لە ناوبەرێ بەلاَم نیچە توانی بە بناغە و پایەی ئارمانجی مەسیحەت هێرش بەری و دوچاری دوو دڵی و رۆخانی کات، نیچە بە بیرو باوەڕەکان کە تا ئەو کاتە بەلای هەموانەوە قەتعی بێ ئەم لاو ئەولا بوو گاڵتە بکات و بە پوچیان بزانێ، نیچە سەبارەت بە زەردەشت لە ووتاری سەرەتایی لە مەڕ گەورەترین و دواییترین مەردی (سیاو) کە زۆر تولانی و درێژە، سەبارەت بە رەوان و گۆڕانی روح لە سێ حاڵەتدا کە چون روحی ووشترێك دەبێتە روحی شێرێك و لە دواییدا بە منداڵێ دەگوردرێ وە لە بارەی ئەو کەسانەی کە بە جیهانی دیکە بیر دەکەنەوە و دەیان بابەتی دیکە زەردەشتی لە بەرزایی لوتکەی زانستی و مرۆڤایەتیدا زانیوە و ئەم پروفیسورە گەورەیە سەری کرنووشی بۆ زەردەشت و فەرمودەکانی دانـاوە

و له ئایینی زەردەشتدا بڕینی دارێك وەکو کوشتنی مرۆڤێکە کە لەم ئایینەدا هەر کەس منداڵی ببوایە دەبوو تا تەمەنی ٢٢ ساڵەی هەر ساڵێك دارێکی بۆ دابنێ و دای چێنێ و لە دواییدا ئەو دارانەی دەبێتە بەشی ئەو کەسە، ئەوەیە ڕەووشت و نەریتی پەسەند. کە ئەگەر هەموو پەیڕەوانی ئەو ئایینە ئەم فەرزە ئەنجام بدەن ولات دەبێتە بەهەشتی بەرین، ئەو گرینگیە و سرنجدانەی زەردەشت بە ژینگەی مرۆڤ و گیان لەبەران و گیایەکان داویە هیچ زانا و بیرمەند و پێغەمبەرێ بێ‌گومان نەیداوە، زەردەشت ئەڵێ مرۆڤ و دار هەر دوو برای یەکن بێ یەك ژیانیان تاڵە، (بۆ خۆت بیر کەرەوە یانێ چی؟) زەردەشت دەڵێ مرۆڤ لە ڕەستەی گیان لەبەراندا و دار لە ڕەستە گیایەکاندا فراژترین و تەکامول یافتەترین بوونەوەرن ئەو باسەی زەردەشت کە سەبارەت بە نیایشی دایکی ژیان[٢] نیایش ناوی[٣] ژیان، نیایش باووکی[٤] ژیان، نیایشی[٥] هەناسەی ژیان نیایش ئاگری[٦] ژیان، نیایشی برادەر[٧] دار و نیایش هەلگر و دارندەی ژیان[٨] و نیایشی ژیانی[٩] جاودان و هەمیشەگی دەیکات تا ئەمڕۆ هیچ بیرمەند و

---

٢ . زەوین و خاك.
٣ . ئاومایەی ژیان.
٤ . خور و ئینێرژی خور.
٥ . هەوا.
٦ . ئاگر و گەرمی و وزەی ژین.
٧ . دار خوی یاسایە لە ئاینی زەردەشتدا.
٨ . ئادەمی و مرۆڤ .
٩ . زەردەشت ئەڵێ ژیان تەنیا تایبەتی بەم ئەستێرەی ئێمە نیە بەڵکو ژیان لە کەیهانی بێ‌ژمار و ئەستێرەکانی بێ‌حەد و حەسردا هەیە، ئەم ووتە بۆتە هۆی سرنج ڕاکێشانی هەموو فیلسوفانی جیهان.

فیلسوف و پەیامبەرێ نەیکردووە ئەوەتا ولاتانی جیهان تازە بە پەلـە کەوتونەتە بیری پاراستنی ژینگە، من نامەوێ و ناش لێم کەسێ ئاینی ئێستای خۆی تەرك كا و ئایینی دیکە بگرێ بەلام بۆچی لە ووتار و زانایی پێغەمبەر و فیلسوفی خۆمان و خۆتان کەڵك وەرنەگرین و لە باری ژیان و ژینگەی خۆمان عەمەلی پێ نەکەینو بە جێگای توێژ و تاقیق لـە باردی ئاڤێستا و فەرهەنگی کوردەواری دا هەڵێین بۆ هیندوستان و ریـگ ڤیدا و سانسکریت بکەینە خوراکی و خواردەمەنی بیر و بۆ چونی گەنجەکان و خەڵکە خوێندەوارەکەمان هەر چەند ئاڤێستای زەردەشت رێگ ڤێدا و سانسکریتیش دەگرێتەوە چونکە هەموو فێر کردنەکان و تەعلیمات لە زەردەشتە، بەلام بە داخەوە برێك لەو بە ناو نووسەرانە فێر نەبوونە کە لە پێشان خۆیان بناسن و لە دواییدا بە باڵە فرە بچن و برۆن بۆ ئەم لاو ئەولا وادیارە ئەمانە ئەگەری وایان هەیە کە خۆیان بە هیچ دەزانن و فێری خزمەتگوزاری بێگانە بوونە، وەگەرنە لە ولاتی بەهەشتی پان و بەرینی کوردستاندا (پێنسەد هەزار کیلۆمتری) و بوونی چوار وەرز لە یەك کاتدا، بوونی ئەو فەرهەنگی دەوڵەمەندە کە دەتوانرێ تەنێ لـە یەك گوندا دەیان و سەدان پەرتوکی کۆمەلایەتی، فەرهەنگی، ئابوری و بناغەی فیزیوکراتی بە کەڵك توێژ و تاقیق بکرێ و بنووسرێ، برام تاکەی چاودرِوانی بێگانە کەین کە مێژوومان بۆ بنووسێ و لە بارەی زبان و زاراوەکانی کوردی و فەرهەنگی کوردەواری و داب و نەریتی و ئابووری و کۆمەلایەتی شتمان بۆ بنووسن تاکەی چاودرِوانی خەیار و تەماتە و

سێوزەمینی و بادام زەمینی و کەلەم و کاهو و سێو و ... بێگانە بین، و ولاتی ئێمەلە هەموو بارێکەوە بەهرو و ئامادەیە بۆ هەموو کشت و کاڵ و دانەوێڵەی بەرهەمی و خواردەمەنی و هەزاران شتی خەڵکی نیازمەند زۆربەی خەڵك فێر بوونە، لاق راکێشان و بخۆن و لە فەرمانڕەوایانی خۆیان رەخنە بگرن کە بۆچی پارەیان نادەنێ کە هەڵبەت رەخنەگرتن باشە بەلاّم ئەو کەسەی کە رەخنە دەگرێ دەبێ رێگای چارەشی نیشان بدا، جگە لەوەش زۆر لە فەرمان ڕەوایان هەن کە بە گوریسێ هەزار پویەوە خۆیان بە سەندەڵی پەیس و مەقامەوە بەستوە و بە جێگای کار و ئیش بۆ خەڵك، وان لە بیری پڕ کردنی گیرفانیانا، فەرامانڕەوا و فەرمانبەر لە هەر دایرەیکدا کە دەبێ لە ئیش و کاری خویدا) پسپۆر بێ و چارەسەری تەنگ و چەڵەمەی خەڵکان بکات و فێری ئیش و کاریان بکات نە وەکوو ئەو فەرمانڕەوایە بێت کە شێخی سەعدی باسی دەکات ئەڵێ خەڵکی جارێکان لە بابەت بەرهەمی پەمودکانیان لە بناری رۆباری نیل سکالاّیان بردە لای فەرمانڕەوایی میسر و وتیان : قوربان ئەم ساڵ رووباری نیل توغیانی کردووە و زیانی زۆرمان لێ کەوتوە، جەنابی فەرمانڕەوا فەرموی جا بۆچی خوریتان نەکێلاّوە، تا زەرەر و زیان نەکەن بەڵێ ئەم ئەمیرە زور پسپۆر و زانا بود. هەڵبەت خوا هەڵناگرێ فەرمانڕەوایان و زانایان و مامۆستایان و ... دڵسوزی زۆریشمان هەیە کە کار و ئیش بۆ ولاّت دەکەن بەلاّم دەبێ خەڵکیش لە تەمەڵی و بێکاری و چاوەڕوانی موچەی حکومەت دەست هەڵگرن و چالاکانە و ولاّتەکەیان بە کار و ئیشی خۆیان پێش خەن، تەنیا

کار و نێشی چالاکانه و پسپۆڕانه و کارگێری زانستی دەتوانی و وڵات پێش خاو و خەڵك لە هەموو شتێك بێ‌نیاز کا.

ئیسماعیل ئەیوبی (سمکۆ ئەپرام)

٢٣ی خاکەلێوەی ٢٧٠٩ کوردی ١٣٨٨/١/٢٣ کۆچی خوری

## ووشەکانی ئاوێستایی، سەنسکریت، کوردی

| ژ | کوردی | بە شێوەی لاتین | سەنسکریت | ئاوێستایی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | گایاگاوی | Gam | گام | گام |
| ٢ | گرێ – گەلو (قورگ) | Griva | گریوا | گریوا |
| ٣ | دور | Durat | دورات | دورات |

لەم ووشەدا دو پیتی دوایی لابراوە بۆتە دور، زۆربەی ووشەکانی دانرا دوایی ماوەیێك دەسوێت و هاسانەکەی دەمێنێتەوە.

| | بەرزی - بەرزترین | بەرهیستە | بەرزیشت |
|---|---|---|---|
| | | (Barhisthe) | (Barezishte) |
| ٤ | مژ (میغ فارسی) | مێغەم | میغیم |

لە فارسیدا کە زۆربەی ووشەکانی لە کوردی گرتوە بە مژ و ئەم میغ ئەڵێن کە لێرەدا زۆر پیتی لێ لابراوە وە غ بە ژ گۆڕدراوە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٥ | هەور | ئەبەرێم | ئەورێم |

لێرەدا ووشەی ئەورێم ئاویستایی نیزیکترە بە ووشەی کوردی ئەمڕۆ کە بە جێگای ئەورێم، هەور کە لە ریزی پێنجدا ووترا.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٦ | جنایەت - دەکوژێ، کوشتن | هاناتی | جانیتی |

ووشەی جانیتی ئاوێستایی کە هاتۆتە نێوی زبانی عەرەبیەوە بەجێبەجێ کردنی پیتی ن، ی و لابردنی ی ئاخر بەم جۆرە سواوە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٧ | درو | دروهەم | دروجێم |

ئەم ووشانە خۆی روون کردنەوەی ناوێ بەلاّم ئەتوانین بلّێین ووشەکانی ئاوێستایی بە کوردی نیزیکترە.

| ریز | کوردی | سانسکریت | ئاڤێستایی |
|---|---|---|---|
| ٨ | نێر | نەردم | نەرێم |

ووشەی نێر کوردی و نەردم و نەرام سانسکریتی و نەرێم ئاوێستایی بە هەموو نیرێك چە مرۆڤ و چ گیان لەبەرو چ گیا و چ شت دەوترێ.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٩ | لەمێرد (مێرد) | مەرتیاسبا | مەشیە |

ووشەی مەشیە بۆ ئادەم ووتراوە کە لە کوردیدا ئادەم و حەوای (مەشی و مەشیانە) عارەبیش هاتوە بەلاّم لە مەردمناسی دا بە جێگای ئادەم و حوا لە عاردبیدا (ئادەم و حەوا)

مەشیەو مەشیانە دەووترێ

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٠ | جۆش، خواز | جوشەم | زاوشێم |

پێوەندی دوو شت کە پێکەوە بلکێن و یا کارێك ساز بکرێ لە زاراوەی ئەردەلاّنیدا پێکەوە جۆشی خواردووە یا جۆش دراوە لێرەدا ووشەی سانکریت بەم زاراوە وە نیزیکترە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١١ | دەس | هاستا | زاستا |
| ١٢ | زدڕین | هارێز | زەرویش |

ئاشکرایە کە ووشەی کوردی سۆرانی و ئەردەلانی لێرەدا بە ووشەی ئاوێستایی نیزیکترە کە ووشەی زاستا دوایی رێکو پێك کردنی و گۆرانی (ز) بە (د) و لابردنی هەردوو (١) بۆتە دەس یا دەست وا دیارە ویش لە ووشەی زەرویش ئاوێستایی نیشانەی نیسبەتە کە وەکوو(ین) لە ووشەی (زەرین)ی کوردی ئەمڕۆدا.

چونکە مەبەستی من لە هێنانی ووشەکانی ئاوێستایی (ئاڤێستایی) دا ئەودیە کە نیشان بدەم کە ئاڤێستا و ئەدەبیاتی سەردەمی ئاڤێستایی سەرچاوەی زبان و فەرهەنگ و ویژیاتی کوردی ئەمڕۆیە و خەڵکی ئێمە لە مێژوودا ریشەدارە و وریشەی بە قولایی زەویدا و پەلو و پویی بە بەرزی ئارارات و زاگرۆس و دەماوەندە...داچوەو گەیشتوتە سەر کلاوە بەم جۆرە ووڕاوەی برێك لە نووسەرانی بیٚریشە پوچەڵ دەکاتەوە کە خۆیان لە بناغەدا پوچەڵن.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٣ | یەك، یۆە | ئێکا | ئێوا |

لێرەدا (یۆ)ی زاراوەی هەورامی لە ئاوێستاییدا (ئێوا) و (یەك)ی زاراوەکانی دیکەی کوردی لە (ئێکا)ی سانسکرێت گێراوە و تاش راوە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٤ | دو (دوێ هەورامی) | دڤێ | دڤا |

دووبـارە وەکـوو ریـزی ١٣ پێـچەوانەکەی یـانێ لـە ریـزی ١٣ هـەورامی لەئاڤێستایی گیراوە، لێرەدا هەورامی لە سانسکریت هەرچەند لە هـەردو دەبێ.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٥ | یەرێ (هەورامی) | تری | ثری |

ووشەی یەری هەورامی لە گـەڵ هـەر دوو دا، ئاوێـستایی و سانـسکریت جۆرترە تا ووشەی سێ کە هیچ پێوەندیەکی بمانەوە نیە کە ووشەی ثری لە ئینگلیزیدا یانێ یانێ سێ وە ووشەترێ دارو لە کوردی سـۆرانیدا یـانێ هەنگور کە کچی سێومی زەردەشتیش ناوی ترێیە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٦ | چوار | چەتور | چەتوەر |

چ چەتور سانسکریتی و چ چەتوەر ئاوێـستایی هـەر دوو ریـشەی چـواری کوردین کە خودی سانسکریت، ریشەی لە ئاوێستایە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٧ | پێنج - پەنج | پەنچە | پەنچە |

وەکوو ریزی ١٦

| ریز | کوردی | سانسکریت | ئاڤێستایی |
|---|---|---|---|
| ١٨ | شەش | شەش | خشقەش |

شەشی کوردی ئەمڕۆ لە گەڵ شەشی سـانسکریت بێ زیـاد و کـەم یـەکن وادەر ئەکەوێ کە چینگرەنگها چە فیلسوفی هینـدی و قوتـابی زەردەشـت ووشەکەی زووتر ساویوە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٩ | هەفت - حەفت | سەپتا | هەپتا |

حەوت دیارە ووشە هەفتی کوردی ئەمڕۆ (ئەردەلانی و فەیلی) نیزیکترە بە هەپتای ئاوێستایی.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٠ | هەشت | ئەشتا | ئوشتا |

ووشەی هەشتی کوردی ئەمڕۆ بە هەر دوو ئەشتاو و ئوشتا نیزیکە لە هەر دوو (ئـ) کراوە بە (هـ) و نووسراوە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢١ | نۆ - نەڤا | نەڤا | نەڤا |

دیارە چ نۆوچ هەر دوو لە سۆرانی و بادینانیدا باوە و لە سۆرانی نۆ و لە فەیلی و لوریدا نوی دەوترێ.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٢ | دە | دەسا | دەسا |

بەشی دوم لە سانسکریت ولە ئاڤێستادا لابراوە بوەتە دە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٣ | بیست (ویست) | ویساتی | ڤیسایتی |

ژمارە بیستی زاراوەکانی کوردی و ویستیزاراوەی هەورامی بە ووشەی ڤیسایتی ئاوێستایی نیزیکترە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٤ | سی | تریساتی | تریسات |

لە ووشەی سانسکریتی بە مانای سی (مسات و لە ئاڤێستاییدا تەنیا سات زیاد کراوە تا بۆتە سی بەلاّم خوێندنی ووشەی سی یا سیّ لە شکلّ ووێنە وەکوو یەك وەهان. تری و ثری‌ش وەهان لە ژمارەی سیدا مسات و سات زیاد کراوە.

| ڕیز | کوردی | سانسکریت | ئاڤێستایی |
|---|---|---|---|
| ٢٥ | چل | جەتڤاریسات | چەتوارسات |

لە ووشەی چلی سانسکریت و ئاڤێستاییدا بە نیسبەتی بناغەکەیان کە چ چەتودر و چەتوەرەیتی زۆر زیاد کراوە، بۆ ئەوەی پاشوییێك بێ کە قاعیدە هەرچێ پیت زیاد بێ مانای زیادترە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٦ | پەنجا | پەنچاسات | پەنچاسات |

بەشی دودم لە هەر دوسانسکریتی و ئاڤێستایی (سات) لابراوە بۆتە پەنجا وا دیارە لە سانسکریت و ئاڤێستایی‌دا ووشەی سات و مسات ژمارەی سێ و چوار و پێنج دەکاتە سی و چل و پەنجا..

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٧ | شەست | شەشتی | خیشڤەشتی |

لەو قاعیدەی نەحوی ڕیزی ٢٥ بۆ ژمارەی شەستی سانسکریت و ئاڤێستا کەڵکی وەرگرتوە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٨ | هەشتا | ئەشایتی | ئەشتایتی |

دیارە ژمارە هەشتای ئەمڕۆ بە گۆڕانکاری لە ووشەکانی سانسکریت و ئاڤێستا دروست کراوە بەلاّم ووشەی هەشتا بە ووشەی ئاڤێستایی نیزیکترە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٩ | سەد | سەتا | سەتا |

لێرەدا گۆڕانکاری لە پیتی (ت) بە (د) و تاشین (١) لە ئاخردا بۆتە سەد هەرچەند ئێستاکە سەتیش دەوترێ.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٠ | هەزار | سەهەسترا | هەزانرا |

ووشەی هەزار بە هەزانرای ئاڤێستایی نیزیکترە و لە وداتاشراوە نەك لە سانسکریت.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣١ | دە هەزار | ئەیوتا | بیڤەر |

وا دەرئەکەوێ دانەری ژمارەکان لە جیهانی سەردەمی ئاڤێستایی وسانسکریتیدا لە ریشەی ژمارەکانی ئەسڵی لای داوە و سەربەخۆ بۆ ووشەی دەهەزار کە دەبوایە بیوتبایە دەسا هەزانرا یا دەسا سەهەسترا،دیارە وەکوو ژمارەی برێك لە سەر گرێکان ود وەکوو سەدو سەت کوردی و هاندێرید و ساو زەند (سەد و هەزار) ئینگلیزی ووشەی بیڤەری بۆ دە هەزار داناوە و ئەمەش کارێکی دروستە.

| ریز | کوردی | سانسکریت | ئاڤێستایی |
|---|---|---|---|
| ٣٢ | هەوەڵین | پرەڤەما | فرە تێما(تێما) |

هەوەڵ، یەکەم، یەکەمین

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٣ | دوهەم - دووم دووەمین | دڤیتیا | بیتیا |

دووەمین

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٤ | یەریمین - سێهەم | تریتیا | تریتیا |

سێوم، سیومین

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٥ | چوارم - چوارەمین | توریا چەتورثا | تویریا |

چوارهەمین

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٦ | پێنجەم پەنجم پەنجەمین | پەنچاثا | پوخـــدا ووشـــە کـــوردی ئەمڕۆ لێرەدا بـە ووشـەی سانسکریت نیزیکترە. |

پێنجەمین

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٧ | حەوتم - هەفتم - حەفتم | سەپتاثا | هەپتاثا |

حەوتەم یا حەوتەمین

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٨ | هەشتم- هەشتەمین | ئەشتەما | ئەشتیما |
| ٣٩ | نۆهەم - نویوم | نەڤاما | نوما |

نوهەمین

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٤٠ | دەهوم، دەیوم | دەشاما | دەسێما |

دەهەمین

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٤١ | سەدوم - سەتم | سەتاتاما | سەتوتێما |

سەدەمین

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٤٢ | هەزارەم - هەزاروم | ساهەسراتاما | هەزانروتێما |

هەزارەمین

لەم ژمارانەی ریز کراوی سـەرەوە چ لـە سانـسکریت و چ لـە ئاڤێـستادا وەکوو ژمارەکانی ریزکراوی کوردی

ئەمڕۆ کە ژمارەی پایەیی و بناغەی لە هەموانـدا لـەبیرناکرێ زۆربـە لـە بیرکراون و لە ئەسڵەکەی لای داوە

وەکوو یەك (ژمارەی ئەسڵی و پایە) لە ریز کراودا دەبێتە یەکەم

یەکەمین لە زبانی کوردی ئەمڕودا

وەکوو دوو (ژمارەی ئەسڵی و پایە) لە ریز کراودا دەبێتە دوهەم و دودم

و دووەمین

وەکوو سێ (ژمارەی ئەسڵی و پایە) لە ریز کراودا دەبێتە سێوم

سێهەمین، سیوەمین

وەکوو چوار (ژمارەی ئەسڵی و پایە) لە ریز کراودا چواردم چوارەمین،

چوارهەمین

ودکوو پێنج یا پەنج (ژمارەی ئەسڵی و پایە) لە ریز کراودا پێنجەم یا

پەنجم یا پێنجەمین یا پێنجەهەمین

وەکوو شەش (ژمارەی ئەسڵی و پایە) لە ریز کراودا شەشم، شەشەم

شەشەمین یا شەشهەمین

وەکوو حەوت (ژمارەی ئەسڵی و پایە) لە ریز کراودا حەوتم

حەوتەم، حەوتەمین، هەفتم، هەفتەمین

وەکوو هەشت (ژمارەی ئەسڵی و پایە) لە ریز کراودا هەشتم

هەشتەم، هەشتەمین

وەکوو نۆ،نوڤا نەڤا (ژمارەی ئەسڵی و پایە) لە ریز کراودا نویوم

نوهەم، نوهەمین

نەڤام، نوڤا هەمین

وەکوو دە (ژمارەی ئەسڵی و پایە) لە ریز کراودا دەیوم، دەهوم

دەهەمین، ئەمانە کە نووسیم ئەعدادی تەرتیبی (ژمارەکانی ریز کراون). هەر وەها ژمارەکانی دیکە لە زبـانی کـوردی ئـەمڕۆدا وەکـوو سـیووم، سێهەم سێهەمین تا سەد سەدەمین، سەدم کە لە ژمارەکان ریـز کـراودا هەم نیشانە تەرتیبی و لە شوێنەکی خوارەوە وەکوو دووەم و دوهەم و بالاّ وەکوو دوهەمین، یا سێهەمین کە ئەم جۆرە لە زبانی عارەبیدا نیە کـە لـە زبانی عارەبیدا واحد – یانێ یەك کە ژمارە تـەرتیبی نیـە بـەلاّم الاول وەکوو هەوەڵی کوردیە کە دەگونجێ کە یەکیان لەویتر گیرا بێ کـە هـیچ وێنەکاری و شەباهەتێکی لە گەڵ ژمارەی یەکدا نیە (واحد) کە لە کوردی ژمارەی یەك دەبێتە ریزکراوی تەرتیبی وەکوو یەکەم، یەکەمین بەلاّم واحد نابێتە تـەرتیبی، الاول(یەکـەم مـذکر)، الاولـی (یەکـەم مونـث)، الاولـین (یەکەمین مذکر)، الثانی(دوهەم مذکر)، الثالث(سیووم مذکر) الرابع (چوارم – مذکر)، الخامس(پێنجەم – مـذکر)، الـسادس (شەشم – مـذکر)، الـسابع (حەوتم، مذکر)، الثامن(هەشتم – مذکر) التاسع (نوهەم - مذکر)، العاشر (دەهوم – مذکر) = نێر.

الاولی (مێ)، الثانیه (مێ)، الثالثه(مـێ)، الرابعـه(مـێ)، الخامسه(مـێ)، السادسه(مێ)، السابعه(مێ)، الثامنته(مێ)، التاسعه(مێ)، العاشره(مێ)،

دەڕوانین بەم ژمارانەی عارەبیدا:

١. هاودڵ ناوی بالایی تێدا نیە جگە لە ژمارە اولین.

٢. لەبەر ئەوەی لە لای عارەبەکان ژن و پیاو لە هەموو بارێکەوە جیاوازیان هەیە تەنانەت لە ژمارەشدا جیاوازن بەلاّم لە فەرهەنگی کوردیدا هیچ جیاوازێك لە نێوان ژن و پیاودا نیە کە لە هەموو بارێکەوە چ لە ناو و چە لەڕانا وو چ لە هاوەڵ ناودا هیچ جیاوازییێك نابینرێ ئەمە کە ئێستا لە کوردستانی ئێمەدا لە باری کۆمەلاّیتی و یاسایی و ئابوریەو... ژنان جوێ کراونەتە لە عارەبە و یاسای عارەبیە فەرقی داناوە.

## ووشەکانی جێ ناوی ئاوێستایی ، سانسکریت، کوردی

| ریز | کوردی | سانسکریت | ئاڤێستایی |
|---|---|---|---|
| ٤٣ | من، ئەز | ئەهەم | ئەزێم |

ووشەی ئاڤێستا بە کوردی بادینان نیزیکترە لە سانسکریتدا نە ئەهەم بە ئەزونە بە من نیزیك نیە.

| ریز | کوردی | سانسکریت | ئاڤێستایی |
|---|---|---|---|
| ٤٤ | تو | تڤەم | تو - توم |

دووبارە کوردی لە گەڵ ئاڤێستا دا جورترە، هەرچەند تڤەم زۆر دوورنیە.

| ریز | کوردی | سانسکریت | ئاڤێستایی |
|---|---|---|---|
| ٤٥ | لەتو | تەڤا - تێ | تێ - تەڤا |

هەر وەها دەبینن کە لە ریزی ٤٣ و ٤٤ کوردی ئەمڕۆ زیاتر بە ووشەی ئاڤێستایی نیزیکترە کە لە ریزی ٤٥دا وەکوو یەکن هەرچەند سانسکریت

خۆی ریشەی ئاڤێستایی هەیە چ لە باری مێژوویيە و چ لە باری بوونـەوە چ لە باری بزاڤی جوغرافیدا.

کۆ = جەم.

| ریز | کوردی | سانسکریت | ئاڤێستایی |
|---|---|---|---|
| ۴۶ | ئێمە وێمان | ڤەیام | ڤیم |
| ۴۷ | ئێمە | لم | ئیم |
| وشەی پرسیار | | | |
| ۴۸ | کێ، چی | سك‌کاس | کو |
| ۴۹ | کام | کام | کێم |

لەم راناوانەدا (جێناو) چ سانسکریت و چ ئاڤێستایی و لە بابەتـەکانی دیکەدا بۆمان دەردەکەوێ ووشەکانی سانسکریت و ئاڤێستا هەر دوك بـە هەموو فەرهەنگی ئەو سەردەمەوە جگە لە ووشـەکانی داتاشـراو لـەم دو فەرهەنگەدا خۆیان دلۆپێکی زۆربچوکن لە ئوقیانوسی زبان و فەرهـەنگی کوردی ئـەمڕۆدا بـە هـەموو زاراوەکانیـەوە و ئـەتوانم بلـێم کـە ئەگـەر ووشەکان و مەتەڵەکانی کوردی لە هەموو بارێکەوە لە هەموو زاراوەکانی کوردی کۆ بکرێتەوە هیچ زبانێك لـە گـیتی‌دا بەرامبـەری ناکـات، ئـەو هەموو خزمەتە کە بە زبانی عارەبی کـراوە، فەرهـەنگی بـۆ نووسـراوە، المنجدی تا ۲۹ ( بەوەی کە من دەزانم) بۆی نووسراوە، نسابی ئەحمـەدی و

سوبیانی (صبیان)ی بۆ نووسراوە، نحو و صرف و مەنتیق (منطق) لوژیکی نظری و عملی) و بەیان و بدیع و کلام و عقاید و حکمت و هیئت ی بۆ نووسراوە.

ئەو هەموو کتێبانەی کە لە پەرتوکی نووسراوەی خۆمدا کە بە زبانی فارسی نووسیومە هاتود یانێ لە کتێبی (جامعە شناسی ئاموزشی‌دا) هەموو عاردبین و مامۆستایانی دینی ئەو کتێبانە دەخوێنن و دەیان و سەدان حاشیە و پەراوێزیان لێ کردوە کە ئەگەر یەك میلیونیم ئەوە خزمەتی زبان و فەرهەنگی کوردی بە هەموو زاراوەکانیەوە بکردبایە ئێستا شەپۆلی ئەو دەریایە جیهانی گرتبوە بەر وە لە باری فەرهەنگ و وێژیات ووشەکانەوە هەمووانی دەوڵەمەند کردبوو بەلاّم بە داخەوە لە رابوردودا ئەم فەرهەنگ و زبانی کوردیە خاوەنی پارێزدری نەبووە بەلاّم ئێستا لە سایەی خەڵك و حکومەتی باشوری کوردستانەوە چرای رووناکی هەڵکراوە و هەر نووسەر و زانایێکی کوردە بێ لەم هەل و دەرفەتە کەڵك وەربگرێ و هەر شتێك کە دەزانێ بە شێوازی ئەکادیمیك و زانستگایی بینووسی و لە بەر دەستی خەڵکی خوێندەوار و خوازیاری زانستیدا دای بنێ، ترسی لەوە نەبێ کە ئەم ووشە عاردبی یا فارسی و یا ... چی و چیە کە رەخنەی لێ بگرن بۆچی پەرتۆکەکەت بە کوردی پەتی یا بە کوردی پەسەندی چاپی سەردەم کە بۆ پارە ئیش دەکات نەنووسیوە ووشەکان چ هەورامی چ ئەردەلانی، چ سۆرانی و بادینانی و ئاشیتەیی بێ، هیچ جیاوازیان نیە وتەنانەت کە ئەگەر ووشەکانی عاردبی و زبانەکانی دیکەش لە نێو پەرتۆکەکە تا هەبێ هیچ بەربەستێکی نیە بۆ

ئەوەی ئەو ووشانە هاتوونەتە نێو زبانکەمانەوە و لە باری زانستیەوە پێ ناڵێن ئەدەبیاتی کۆمەلایەتیەکان کە ئاشکرایە، زبان فارسی بۆ خۆی هەموو ووشەکانی لە کوردی و عارەبی گرتوە و زبانێکی جوانی بۆ خۆی ساز کردووە، هەموو ئەو ووشانەی کە لە فارسی‌دا بە کار دێن بێجگە لە عارەبی هەموو کوردین پاسا و دەلیلی ئەمە جگە لە توێژ و تاقیق لەبارەی زبانەوە ئەوەیە کە هەر کوردێك لە فارسی حاڵی دەبێ بەلاَم فارسێك لە کوردی حاڵی نابێ نووسەری ئەم نامیلکەیە لە شادنامەی فردەوسی سێ و هەزار و شەشسەد لاپەڕەی راڤە و تەفسیری کردوە کە چی بە زەحمەت مامۆستایێکی فارسی دەتوانێ دوشیعری مەولەوی یا قانیع یا مەلای بێسارانی وەرگێرێ.

| ریز | کوردی | سانسکریت | ئاڤێستایی |
|---|---|---|---|
| ٥٠ | دەبیەم = مەوروم<br>کوردی کەلۆڕی | - | بارامی |

بە روش هەورامی، بەرای بروش.

| ریز | کوردی | سانسکریت | ئاڤێستایی |
|---|---|---|---|
| ٥١ | دەبیەی، مەودری = کەلۆڕی | - | باراهی |

بەرای و بەریش هەورامی.

| ریز | کوردی | سانسکریت | ئاڤێستایی |
|---|---|---|---|
| ٥٢ | مەوەرو کەلۆری = سێووم کەس | - | باراهیتی |

بۆ ئەوەی ووشەکان زۆرن بە پێویستی نازانم ( وەکو برێك کە لە زانستیدا کەمیان هێناوە و پەنایان بردوتە بەر ...) بچمە نێوی ووشەکانی دیکە و

جێگای کرکە و نوکەیان بەیان کەم چونکە، لە زبانناسی و رێزمان و رێنووسی پەرتووکە کوردیە کەمدا کە لە زستانی ساڵی ١٣٨٢ کۆچی خۆری بەرامبەر بە ٢٧٠٢ی کوردی لە تاران چاپ کراوە و زۆر زەحمەتم کێشاوە کە ئەگەر حەسودان بهێلن خەڵکی خوێندەوار جادەی بۆ دەهێڵن.[١٠]

## کرداری دان و دا بە شێوەی گوزارشتی

| | | |
|---|---|---|
| ٥٣ | دەیدات = کەسی سێوم کوردی | دادایتی - کەسی سێوم سانسکریت |
| | دیدەم - کەسی هەوەڵ کوردی | وە دادامی کەسی هەوەڵ ئاڤێستایی |
| | دەیدەی = کەسی دوەمی کوردی | داداهی کەسی سێوم سانسکریت |

لێرەدا ووشەی داداهی سانسکریت وە دادامی ئاڤێستایی هەر دو بە کوردی ئەمرۆ نیزیکن کە لە کوردی سۆرانیدا دەتوانین بلێین دەت دەمێ

١٠. بە داخەوە زۆربەی نیمچە نووسەرەکانی ئێمە لە بەر نەزانینی خۆیان چاویان هەڵ نایەت بە نووسراوەیک جگە لە نووسراوەی خۆیان بڕوانن جا ئەم نەخۆشینە بۆتە میکرۆبی گیانی زۆربەی دەسەڵاتداران کە ئەم نووسەرە نەزانانە هەڵیان پڕیا دەڵێن. - هەڵێت و پەڵیت دەڵێن وەکوو شاعیرانی دەرباری سوڵتان مەحموودی غەزنەوی خریکی ییا هەڵگوتن وە بە جێگای نووسینی شتی راستەقینە خەریکی ساخت و باختن جێگای ئەمانە دوژەنگە - دوزخ و تاریکی موتلەق.

تاکی هەوەڵ وێژەر  تێپەڕ دەیدەیتێ (لە بەرچاوی تاك) کرداری تێپەڕ دەیداتێ بۆ کەسێ سیوم کرداری تێپەڕتاك.

| | |
|---|---|
| | کوردی ئەمڕۆ دەیدات =داداتو سانسکریت یانێ دەیدات کە سێوم کەسە، تاکە، تێپەڕە، دازدی ئاڤێستایی نەزانراوە |
| ٥٤ | دەیدەن = داستر، کە سانسکریتە، کۆ، سێوم کەس تیَپەڕە |
| | دەیدەن = دوەم کەس، کۆ، تێپەڕ،<br>دادێماهی = ئاوێستایی، کۆ، تێپەڕ، دوەمین کەس. |

| | |
|---|---|
| ٥٥ | گارجێرێنت خوێندن ئەم ووشە ئێستا بەشی هەوەڵی بۆ خوێندنی مریشك، هاتوە کە ئەڵێن مر، گارە گار ئەکا یانێ دەخوێنی. |
| | وە بەشی دوەم، جیڕەی درگا، دەنگەکان لە هەودڵەوە زۆربەی لە گیان لەبەرانی دیکە گیراوە کە دەبێ بڵێن:<br>دی ئاڤێستایی یانێ دیتن، دیدایا ئەو دیتوویە یا دین یانێ دیتن لە جیهانی دیکە دین ووشەیەکی کوردیە. |

| | |
|---|---|
| ٥٦ | تو - توانا توتاڤا یانی ئەو کەسەی توانا بوو = یانی تۆ دەبێ کورت کراوەی توانا یا توتاڤابێ. |

| | |
|---|---|
| ٥٧ | روچ راوچایاتیی ووشەیەکی ئاوێستاییە یانێ رونی دەکات، رۆشنی دەکات کە لە زاراوەی هەورامیدا بە خۆر، کە روونە روچیار و بە رۆژ روچ دەڵێن. |

| | |
|---|---|
| ٥٨ | ووشەی جان جانیتی = یانێ جنایەت دەکات، دەکوژێ کە ئەم ووشەی ئاوێستاییە چۆتە نێوی زبانی عاردبییەوە و بۆتە جنایەت (سەرچاوگە) جانی کردار کەرویە یانێ جنایەت و جنون و جن هەموو لە یەکن و جانی ئیسمی فاعیلە (ناوی کەرویە). ووشەی دادا، پیتی ئاوێستاییە و یانێ دەیدات کرداری گوزارشتی کەسی سێومە. |
| ٥٩ | خشای خشایا پیتی یانێ پادشایی کرد، دەبێتە کرداری رابوردوی هەرو لێکدراوی، خشتریتە و خشایار ریشەکەیان لەم ووشەیە. |

| | |
|---|---|
| ٦٠ | تاپ تاپا پیتی = یانێ گەرمی کرد کە ووشەی تەو کە لەتەوو لەرزدا دێت نیزیکە بەم ووشەی ئاوێستاییەوە هەڵبەت لە دواییدا سەبارەت بە بیماریەکان دێت کە ووشەی تەوبە جیا هاتوە ووشەیکیش بۆ تەو و لەرز یا لەرز تەنیا هەیە. |

| | |
|---|---|
| ٦١ | ریش روچایا پیتی یا زامی کرد کە لە هەورامیدا دەڵێن دڵم، دەروونم رێشەن لە شیعرەکانی مەولەوی یا ووتە و گفتاری خەڵکدا هەیە دەڵێن دەروونم رێشەن یا ریش بیەن. |

| | |
|---|---|
| ٦٢ | ڤین = بین. دیتن ئاوێستاییە. |

| | |
|---|---|
| ٦٣ | ژیو ئاوێستایی یانی ژیان. |

| | |
|---|---|
| ٦٤ | خڤەر یانی خواردن Khvar. |

| | |
|---|---|
| ٦٥ | زان یانیٚ زایین = منداڵ بوون سەرچاوگەیە. |
| ٦٦ | ڤەر = شت لەبەر کردن (جل و بەرگ کە لە کوردیدا دەڵێن کراسەکەی کردە بەری لە هەورامیدا گجیەکیش کەردەن وەرش = ڤەری. ئەم ووشە بە هەورامی و زاراوەکانی دیکەی کوردی نیزیکە. |
| ٦٧ | چەر یانیٚ لەوەڕینی گیان لەبەرکە لە زاراوەی ئەردەلانیدا هەیە دەڵێن چەرندە و پەرندە یانیٚ چوار پایان و باڵندەکان. |
| ٦٨ | ڤیدزانین = دەگونجیٚ ویت زانین بیٚ ختاب بە کەسی دوم کە زانی کردوە زایگە یا دەبیٚ هەر زانین نەمرۆش بیٚ. |
| ٦٩ | ڤەزا ووزە، نیرو کە ئەمڕۆ لە کوردی سورانیدا ئەڵێن ووزەی کارە باووزەی برق یا ووزەی ئاو = نیروی ئاو، نیروی بەرق، هێزی ئاو. |
| ٧٠ | گوشا گوهیٚ یانی گویٚ کە لە هەورامیدا دەڵیٚ گۆشت جەواتەی پیر شالیار بۆ، هوشت جەلای زانای سیمیار بۆ. |
| ٧١ | چەخرا = چەرخ چەرخی کاریگەر گرێکار کە شتی پیٚ هەڵدەگرن بە زاراوە کوردی باشوور عەردبانەشی پیٚ دەڵێن. |
| ٧٢ | تاشان= پێك هێنەر کە شتێك لە داربتاشریٚ، دارتاش یا ریش |

| | |
|---|---|
| تاش، داهێنەر، ڕیشێ چەنی من نەیو بە حوزور مەبوو بتاشوش تاوە نەفخ سور. (مەولەوی) | |
| یورڤان = رەوان = روح عاردبی. یانێ لە کوردیدا رەوان لە ئاڤێستای سەرچاوەدا یورڤان وە لە عارەبیدا روح. | ٧٣ |
| مەزدن مەزن، گەورە = دەریای مازندران یانێ دەریای مەزن دەران – دەرەکانی گەورە خودی مەزندرانی هەر کوردیە جێ پای کورد لە هەموو ولاّتانی دەور و بەردا بوونی هەیە. (لە رۆژ هەلاّتی نێوە راستدا). | ٧٤ |
| هەن جەمەنا (هەنجەمەنا) ئەنجومەن کە ئێستاش هەر ئەودیە کە لە هەورامانی تەختدا کە پێتەخت بووە و شار و هەروامانی بیەن، ئەنجومەنش بیەن، پێش لە ئاییینی ئیسلام. | ٧٥ |
| میڤانا، میهەن، نیشتمان، ماڵ ئەم ووشە زۆر نیزیکە بە ووشەی میهەن. | ٧٦ |
| روچانا، روشنایی، روناکی، بان جێلە، کونای سەربان یانێ روچ و روچیار و روچانا ریشەیان یەکە. | ٧٧ |

| | |
|---|---|
| ٧٨ | زایانا زستانی یا زایاما یا زیما، زستانی، زستان، زستانی سارد سەردی زستان زستانی بەفری، زستانی پڕ بەفر، بەفری زستان و ... |
| ٧٩ | نەر... نێر، پیاو، مەرد، مەردی مەیدان، نامەردی، مەردانەگی پیاودتی ناپیاوی، بوونە پیاو. |
| ٨٠ | ئیناه = گوناه، گوناح، گوناح کردن، بێگوناح، عەینی گوناح، گوناکار و ... |
| ٨١ | تیمە - تاریکی کە لە ووتاری خودی دوژنگە هاتوە کە لە دوژمەتە، دوژوەختە، دوژرشتە کە دەبێتە تاریکی موتڵەق کە یانێ بیری خراپ و وتاری خراپ، کردوەی خراپ کە لە موقابیل هومەتە، هورەختە، هورشتە [11] یانێ بیری چاك وتاری چاك کردەوەی چاك. |
| ٨٢ | ئایسانا ئیسانا پاوشایی کردن، سان - پاوشا لە زاراوە هەورامیدا سان یانێ پاوشا، فەرمانڕەوا، سان و هەورامانی سان و پاوەی سانان دژ، کانی سانان کە سانان دژ ئێستا بۆتە سنندج کە وشەی هەورامی بۆ پاوشا زۆر رەسەنە. |

١١ . هەر وشەیێک لە ئاوێستادا هو لە سەرەتایەوە هەبێ یانێ نیک، باشی، چاک بەڵام ئەگەر دوژ لە هەوەڵیەوە بێ یانێ خراپ بوە.

| | |
|---|---|
| ٨٣ | ئەزی، ئەژدیها ئەژیش هاتوە. |

| | |
|---|---|
| ٨٤ | کاڤی لەقەبی زەنجیرە پاوشایانی کیانیە یا بە مانای زانا دەرەفشی کاویان یا کاڤیان کە بە ئالاکەی ئێران ووتراوە کە لە پێشان پێشبەندەکەی کاوەی ئاسنگەر خنکێنەری زوحاکی مار بەدۆش بووە یانی فەریدونیش[١٢] لە کاڤیانە = لە کیانیانە. |

| | |
|---|---|
| ٨٥ | یازانا پەرستش یەزدان لەم ووشە گیراوە. کە لە دواییدا بودتە یەزدان خواکانی ئارییەکان یەزیش هەر وەهایە. |

| | |
|---|---|
| ٨٦ | کارشی = فلکە = مەیدانی گرد، دەگونجێ ئەو کاتە مەیدان جێگای کۆ بوونەوەی کرێکاران بۆ بێ کە ئێستاش وەهایە وە بۆ کرێکار بایەخیان داناوە کە ووشەی کار لە کارشیدا هەیە. |

| | |
|---|---|
| ٨٧ | زەیری = زەرین، زەرد - زەرینەی هەودتو، چالە زەرینەی خۆمان کەخاکەکەی زێرە، یا زەرین ئاوا، ولاتی مە هەموو پڕ لە زیرێ سپی و زەرد و رەش کە چی خەلکی هەژار و داماوە، بێ رومەت و چاوی گەش. |

١٢. ئەم بابەتەم لە وەلامی شاملودا نوسیەوە و بە فارسیەو داو مەبە مامۆستا رەحمان ناوێک لە خورمالدا وەرگیری بە کوردی نیتر نازانم چی کردوە.

| | |
|---|---|
| ٨٨ | کەنین - کچ - کناچە، کەنی<br>کەنیان و کەنیان گۆرانی یە لە لای کوردان بە کوێری چاوی دوژمنان. |
| ٨٩ | زەیرپینا زەڕین لە ریزی ٨٧ دا وتم. |
| ٩٠ | پورو پڕ - کە ووشەکە لە پوورۆ ساز کراوە کە دەفرێك یا چاڵ ئاوێك کە ئاودکەی یا شتێ لە خوارەوە بێ لەروەو نیە کە پڕ بوو دەکەوێتە رو پڕ دەبێ = پور و پڕ. |
| ٩١ | دریز و دەوریش - دەریوزە دەربەدەر. |
| ٩٢ | تەنوز - تەنیا تەنێ، کەسێ<br>هەر وەها دەبێ، ووشەکان هەموو دوای ماوەییەکی زۆر سوهان دراوون ورێك و پێك کراون تا بە شێوازی ئێستا دەرهاتوون بە، گوێرەی زاراوەکەی و جێگای دانیشتنی (جوغرافیا و کەش و هەواو ژینگەی سورشتی)، کۆمەلایەتی جیاواز هاتۆتە ئاراوە. |
| ٩٣ | تەنو - تەن<br>تەنوو تەن زۆر جیاواز نینە بەلام دەمەوێ لێرەدا ئەمە بلێم کە کوردان کاتێکە فێری زبانی هیجایی بوونە هەودلێن ووشەکان زۆر بە هەورامی بوە بۆ ئەوەی لە زۆربەی منداڵانی تازە فێر بووی زبانم پرسیار کردووە بە جێگای خۆم و ئەخۆم خۆمان ووتویانە |

| | |
|---|---|
| ئەوەم، وەم ودمان کە ویم، وەرۆ، ویمان هەورامیە یانێ کرکەی (و)ئاسانتر بوە بۆ مێشکی منداڵ کە مرۆڤیش لە دوای یەك سەد هەزار ساڵ تازە توانیوە ووشە دروست کات و کرکەی پێ بکات کە زبان ناسان دەڵێن نۆسەد هەزار ساڵە زبان پەیدا بووە یانێ کاتێکە مرۆڤ پری مات بود (ئینسانئا) وەکوو منداڵ کلیماتی[١٣] موتقاتیعی ووتوە و نەیزانیوە رستە درووست کات. | |
| مەرکا - مەرگ<br>یا مەر لە شاری سنە خەڵکی گشتی هەروەها ناوچەکانی کامیاران و لەیلاخ و دیواندەرە (گ) تەلەفوز ناکەن. | ٩٤ |
| هوشکا - ووشك<br>بە زاراوەی فەیلی نەڵێن هویشك (بە ئیشمام) نە ژیر نە بۆر، لە زاراوەی کەڵهوریش‌دا وەهایە کە ئەم جۆرە لە زبانی تورکی و عارەبی و زۆربە لە فەرانسەوی‌دا هەیە، یانێ کرکەی ووشەیێك نە بە ژیر نە بە بۆر، بوێر ترکی، قُولَ بە ئیشمام بە جێگای قیل عارەبی و موسی لە فەرانسەدا. | ٩٥ |
| دوتا – پێغەمبەر<br>داتا، دوتا، دامی پێکەوە زۆر نێزیکن بە مانای دارای شت بوون کە هەم پەیامبەر و هەم دامی کە خودایە بە سەر چاوەی بوون دانراوون. | ٩٦ |

١٣. ووشەکانی لە یەکتر بچڕاو.

| | |
|---|---|
| ٩٧ | ئەنگوستا - ئەنگۆشت — قامك<br>لە سنە و ناوچەکانی کامیاران و لەیلاخ و دیوانـدەرە و ناوچـەی چەم شاریی سنە ئەنگوس دەڵێن وە ئەنگوشتیش هەم. |

| | |
|---|---|
| ٩٨ | زاستا زەستا<br>مەعلوم و ئاشکرایە کە بۆ جیاوە بوونـەی شـێوەی ووشـەکان،و ئاسانکاری پیتی (ز) گوردراوە و دواییکەی ئاشراوە بۆتە دەست. |

| ریز | کوردی | سانسکریت | ئاڤێستایی |
|---|---|---|---|
| ٩٩ | ماتەر | - | دایك، مادەر |
| لە زاراوەی کوردی هەورامیدا ئەڵێن ئەدا کە (د) کە کرکەی پیٚ نـاکریٚ ماتەر لە ئاڤێستادا و مادەر و ما زێر لە فارسـی و ئینگلیـزی دا کـە هەر دوو لە زبانەکانی هیند و ئوروپین کـە لـە بناغـەدا فارسـیە کـەی ئەمڕۆ کوردیە لە زاراوەی سنەدا دادا،دایکە ئەڵێن. | | | |
| ١٠٠ | ستویتی | Stuiti | ستایش |
| پەسن، ستودە لەو ووشانەی کە تەنیا ووشەی ئاڤێـستایی هـەن مانـای ئەوەیە کە ووشەی سانسـکریتە کەم وە دەست نەکەوتوە بەڵام مەبەسـتە ئەسڵیەکەم کە ئاڤێستا سەر چاوەیە، وە دەست کەوتوە. | | | |
| ١٠١ | پەیتی | Peiti | پەت - بت خوا ئاغا |

<table>
<tr><td>١٠٢</td><td>یاتو</td><td>Yatu</td><td>جادو</td></tr>
<tr><td colspan="4">جیاوازی دین و جادو، جادو ئەوەیە کە ئەیەوێ بە سەر هێزەکانی ماورای سورشتدا زاڵ بێ، پیروانی دین بە پێچەوانە خۆسپار و تەسلیمی هێزەکانی ماوراڵتەبیعە دەبن.</td></tr>
<tr><td>١٠٣</td><td>خراتو</td><td>Khratu</td><td>وورد- خورد بچوك</td></tr>
<tr><td colspan="4">لە زاراوەی ئەردەلانیدا جگە لە وورد، خاکە و واڵەش دەڵێن یا ورد و خام بە زاراوەی کەلوڕی و فەیلی خویرد بە ئیشمام.</td></tr>
<tr><td>١٠٤</td><td colspan="2">ژیاتو (جیاتو)</td><td>ژیان</td></tr>
<tr><td colspan="4">ژین و ژینگە، جێژوانێ لەم ریشەن.</td></tr>
<tr><td>١٠٥</td><td>ئوشترا</td><td>Ushtra</td><td>ووشتر، حوشتر</td></tr>
<tr><td colspan="4">ووشتر سوار، ووشتر بار، ووشتری نێر و وشتری مێ، بێچوە ووشتر، یا حوشتر، لوقەی ووشتر.</td></tr>
<tr><td>١٠٦</td><td>یەخێدرا</td><td>Yaekhedhra</td><td>کەمەربەند، یەقە یەخە.</td></tr>
<tr><td colspan="4">یەخە چلکن، کەمەربەندی زێڕین، کەمەر بەندی قایش، کەمەر بەندی سوور، کەمەربەندی سەوز، کەمەربەندی رەش، یەخەی کورت، یەقەی باریك، یەقەی ئاڵمانی، یەقەی ئینگلیزی کە ووشەی یەقە یا یەخە دەبێتە ووشەی لێکدراوی.</td></tr>
<tr><td>١٠٧</td><td>مەزدرا</td><td>Mazdra</td><td>زانا - دانشمەند.</td></tr>
<tr><td colspan="4">ئاهورا مەزد، مەزد یەسنا، زانین پێزانین، زانستی زانایی، زانکۆ لە یەك ریشەن.</td></tr>
</table>

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٠٨ | ستاس ثوا | Stasthwa | ستایش کردن. |
| له ریزی ١٠٠ دا ووتراوه. | | | |
| ١٠٩ | گیتا | Geatha | گیتی ، گیانلەبەران، بوونەوەران. |
| ئاو، مانای زەوین و زەمینە. | | | |
| ١١٠ | چیثا | Chita | سزا |
| ١١١ | سزادان ئاڤێستایی بە وردی لە گەڵ چەند زاراوەی کوردی ئەمڕۆدا یەکن. | | |
| ١١٢ | یوغدا | Ukhda | ووشه - سوخەن |
| سوخەن زان، سوخەران، سوخەن وەر، ووشە = واژە، سوخەن پەروەر، سەعدی شیرازی کە خۆی کوردە ئەڵێ: **(سخندان پرورده پیر کهن، بیاندیشد و آنگاه بگوید سخن)** | | | |
| ١١٣ | یاغدا | Yakhda | شۆخی گاڵتە |
| گاڵتە، گاڵتە و گەپ، شۆخ، شۆخ چەشمی، شۆخی کردن، گاڵتە کردن | | | |
| ١١٤ | ئەستی | Asti | دەستور، وەزیر |
| دەستور فەرمان، وەزیر، وەزارەت، وزرای عارەبی، وەزیر، شالیار، شالیاری ناوخۆ، شالیاری دەرەوە شالیاری بەرگری، شالیاری ئابوری وە ... | | | |
| ١١٥ | یازنا | Yasna | نیایش |
| نیایش کردن، کرنۆش بردن، نیایشی ئاو، نیایشی خۆر، نیایشی هەڵگری ژیان، نیایش ژیانی جاویدان و... نیایشی خودا، نیایشی یەزدان، نیایشی خوای رووبار و ئاناهیتا. (نیایشی یەزدانی باران) | | | |

<table>
<tr><td>١١۶</td><td>پەرێنا</td><td>parana</td><td>پەڕ، باڵ.</td></tr>
<tr><td colspan="4">پەڕ و باڵ، پەرین، بێپەڕ و باڵ، باڵ گرتنەوە، بێپەڕ و پۆ، باڵدار، باڵوین، باڵی کورکورە، باڵی مە لیچیك، پەڕی چۆلەکە، باڵی مر، باڵی مریشك، باڵی قشقەڕە، باڵی ڕدشە هەڵو، لای هەڵوی بەرزە فڕی بەرزە مژی، چۆن بژی شەرتە نەوەك چەندە بژی، (نیلخانیزادە)<br>نەوەی بە ئازادی ژیابێ تاوێ ژینی قالاوی بە پووشێك ناوێ (مامۆستا هەژار)</td></tr>
<tr><td>١١٧</td><td>کەمنا</td><td>Kamna</td><td>کەم</td></tr>
<tr><td colspan="4">کەمایەتی، کەمینە، کەم بوون، کەم و زیاد.</td></tr>
<tr><td>١١٨</td><td>دروناه</td><td>Draonah</td><td>دەرون - ناو</td></tr>
<tr><td colspan="4">دەرون ناسی، کەم دەرون، بێدەرون، دەرونی خراو، ناو دڵ، ناو سك، ناوی ڕیخۆڵە، ناوی گورچیلە، ناوی ڕیخۆڵە کوێرە، ناوی ئاو، ناوی ...</td></tr>
<tr><td>١١٩</td><td>رافوە</td><td>Rafoah</td><td>ئاسوودەیی رفاە و ئاسایش</td></tr>
<tr><td colspan="4">ئاسوودە بوون، ئاسوودەگی، راحەتی، ئاسودەگی ژیان، ئاسودەگی وڵات، ئاسودەگی بنەماڵە، ژیانی ئاسوودە، رافویارافا، یا ڕەفاهاتوە.</td></tr>
<tr><td>١٢٠</td><td>سرونی</td><td>Sraoni</td><td>سەرین، ژێرسەر</td></tr>
<tr><td colspan="4">سەرێن راحەتی، سەرین خەو، سەرینی پەرقوو، سەرینی پەڕ سەرینی پەموو سەرینی پەڕۆ، سەرینی دوو نەفەرە، سەرینی یەك نەفەرە ئەوەندە لەم بابەتەوە ووشەی لێکدراوی هەیە کە بە پێویستی نازانم بۆ هەموو ووشەکان بینووسم.</td></tr>
</table>

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٢١ | فزونی | Fsaoni | چاخی - قەڵەوی |
| به زاراوەی سنه = ئەردەلانی چاخی ئەڵێن، چاخی پیاو، چاخی ژن، ژنی چاخ، پیاوی چاخ، گاوی چاخ، بزنه قەڵەو، مریشکی قەڵەوە، خودی فزونی یانێ زیادی - که دەبێته چاخی و قەڵەوی، قەلیان چاخ کردن. | | | |
| ١٢٢ | بانو | Banu | بان - رۆشنایی - رون |
| خودی بان دەبێ به مانای رووناکی، چونکه خۆر له پێشان دەدات له بەرزایی و بان، رۆشنایی خۆر، رۆشنایی ئاگر، ئاگری روون، رۆن کردنی چرا، روشن کردنی تەنور، تەنور داخستن، رۆشنایی بان جێڵه، کونای رۆشنایی، رۆشنایی کوناێ شقارته رۆشن کردن به زاراوەی ئەردەلانی گۆگرد روشن کردن. | | | |
| ١٢٣ | جێرێنو | Gerenu | خوران — خارش |
| خوریان، پشت خوران، خوراندنی پشت، خوراندنی سەری چاروا (بۆ ئارام کردنی) یا خوراندنی سەرمانگا بۆ شیردانی، خارشی هەیه بەو جۆرەی که ئەگینا وای نەدەکرد، خوراندنی چاو، گوێ خوراندن، خوراندنی سەر، سەرخوران، سەری دەخورێ. | | | |
| ١٢٤ | تەفنو | Tafnu | تەو — تەف |
| تەوویاو، یاوو لەرز و تەو لەرز، تەوی ٣٨ پله گەرمی، داخ بوونی بەدەن، تەوی مالت، تەوی مالاریا[١٤]، تەوی وی واکس[١٥] تەوی فالیسپارم[١٦] تەوی[١٧] ئووالە. | | | |

١٤ . سێ وه روسێ رۆژ جارێک.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٢٥ | دینو | Daenu | مانگا - گای مێ |

دینو مانای هەیە، مانگا ماوەیەك موقەددەس و جێگای پەرستش بـوە و ئێستاش لە هیندوستاندامۆقەدەسە، مانگا لە بەر ئەوەی شیری دەدا و شـیریش خـواردنی کامیلـە و هـەموو ویتامینـەکانی تێـدا هەیـە، مانگازاو، مانگای قسر، مانگـای ئـاووس، مانگـای شـێت، مانگـای ئارام، مانگە شەو، مانگای شاخدار مانگای شاخ شکاو، هەر وەکـوو عارەبو ووشتر دەیان نێوی هەیە چونکە جێگای کەڵکە بۆ مرۆڤی کورد.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٢٦ | هومه | Haoma | هومه |

هومە دەفرێکە لە گڵ دروستی دەکەن، دوای سورەوە بوون کە لە کورەی کلدا سوری دەکەنەوەوە، هومە لە کوزەیا کویزە گەوردترە و لە پێـشان (لە مێژینـەدا مردویـان تێـدا دەناشـت، هومـەی دۆ، هومـەی ئـارد، هومەی ئاردە تو، هومە جێگای متمانە و زەخیرە بووە کە لە مـشك و گیان لەبەران مەحفوز بووە. هومە یا هوما بـە گیـای موقـەدەسیـش ووتراوە کە یەکێ لە ئیزەدەکانە و زۆر بەنرخە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٢٧ | باما | Bame | بان |

بەرزایی، سەربان، بانی کێو، بانی ئەسب، سەربان جیلـە، بـانی کونـا، بانی بەرز، بانی نزم، بانی لێژ، بانی قیرتاو، بانی ئیزوگام یـا ئیزوبـام،

١٥ . ئەوی دو رۆژ جارێک.
١٦ . ئەوی یەک رۆژ جارێک.
١٧ . ئەوی یەری روجارێک - سێ رۆژ جارێک لە ئەفریقادا هەیە وەکو مالاریا وەهایە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| بانی سیمانکاری، بانی تاق و ئاسنگ، بانی گڵی و ... | | | |
| ١٢٨ | تاخما | Takhma | بەهێز، تیژ |
| چیتران تاخما، ناوی سەرداری مادی کە لە هەولێردا بە دەستی تەهماسپادای هەوەڵین جاشی کوردەواری بەکرێ گیراوی داریوشی هەوەڵ، کوژرا یانێ نژادی ئازا و بەهێز لە هۆزی سگارتی سەقزەوە ١١ مانگ حکومەتی کردوە. بەهێز بوون، بێهێز، هێزی ئاسمانی، هێزی زەوینی و ... | | | |
| ١٢٩ | ئاسمان | Asman | ئاسمان – ئاسمانگ، سەنگ، مەرد |
| وادیارە لە زبانی ئاوێستاییشدا ئاسمان پیاوە و زەوی مێ و ژنەوە وادیارە سەمای عارەبیش لەم ووشە گیراوە ئاسمان بە مانای بەرد و بەرز هاتوە، هەردوو مانای هەیە و ... | | | |
| ١٣٠ | رەسمەن | Rasman | ستون، روتبە |
| ستونی دار، ستونی ئاسنگ و ستونی ئاسمان، بە مانای حەماڵی عارەبیە، روتبەی پلە و پایە حەماڵ و وشەیەکی عارەبیە، ئاسمان بێستون راوەستاوە، بیستونی کرماشان کە ئاسەواری داریوشی هەوەڵە، کە سەرانی هەموو ولاتانی ژێر رەکیف هاتوونەتە لای شاو بە خەتی بزماری نووسراوە و فەروەرتیشی مادی بەجل و بەرگی میدیاکان گیراوە و ناوی گوماتاش هەیە بە نووسراوەی، نووسەر لە وەلامی شاملودا بە زبان فارسی بڕوانن. | | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٣١ | ڤیشمەن | vaeshman | نشیمەن - جێگای نشتن، دانیشتن |

ئێستا ئەڵێن ئوتاقی نشیمەن، هوددی نشیمەن، هەرجۆرێك بڵێن ئەم ووشە نشیمەن ریشەکەی لە ئاڤێستادا هاتوە، جا ئەوانەی کە کورد رێژ دەدەنە پاڵی قەومی ربیعە و نەزاری عارەبی با بزانن زۆر نەزانن و لە نەزانیندا هەر دەبێ بمانن.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٣٢ | تووخمەن | Taokhman | توخم - نژاد |

بڕوانە ریزی ١٢٨ کە تاخما بە مانای بەهێز بوون، توخمەن یانێ توخم و نژاد وادەر ئەکەوێ کە لەئەسڵی ووشەکەدا مانای بەهێز بوون هەیە یانێ بوونی توخم و نژادی بەهێزی نەتەوەیێك دەگەیێنی، توخمی مرۆڤ یا تۆمی ئادەم، تۆمی گەم، و تۆمی دانە و حبوبات هەموو زیندوون و ژیانیان تیا هەیە کە لە داستانی دانە گەنمەکەی کە زەردەشت کە دای بە گوشتاسب دەرئەکەوێ.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٣٣ | دامی | Dami | ئافەریدەگار- خواوەند |

دادار، دادەن، دانەر، پێك هێنەر، داهێنەر هەموو هەم مانای ئافەریدەگار و دامی دەگەیێنێ و هەم ئافەرینش، ئافەریدەن، ئافەرین، خودا، خوا لەخۆوە هاتو، هەموو لە بنەماڵەیێکن و باشتر لە ووشەی اللّهیە بۆخوا، بە ریزی ١٠٧ و ٩٦ بڕوانن.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٣٤ | زامی | Zami | زایین، لەدایك بوون |

زام و زان هەر دوو بە مانای زایین، بوون کە زامی ئەمڕو بە مانای زەخمە کە لە بەدەن و تەن پێك بێ بەلاّم ئاشکرایە خودی زاینیش جۆرە

<table dir="rtl">
<tr><td colspan="4">زامێکە، و زان ئێستا بە مانای زانستی هاتوە بەلاّم خـودی زانینـیش جۆرە زامێکە، هەلّبەت لە هەوەلّەوە ووشەی زامی سوهان نەدراوە[١٨].</td></tr>
<tr><td>١٣٥</td><td>گەرێما</td><td colspan="2">Garema</td></tr>
<tr><td colspan="4">گەرم، گەرما، گەرمای کل، گەرمای خـۆر، گـەرمای ئـاگر، گـەرمای عیشق، گـەرمای هـاوین، گـەرمای شـارەزوور، گـەرمای گەرمەسـێر، گەرمای تاوسان کە تاوسان خۆی یانێ گەرم وەکوو تاو وەکـوو یـاو کـە گەرمە.</td></tr>
<tr><td>١٣٦</td><td>بومی</td><td>Bumi</td><td>بوم، زەمین، ئاو و خاك</td></tr>
<tr><td colspan="4">ئێستاش لە هەموو زاراوەکاندا لە و لاّتی ئێمەدا وشەی بوومی یا بۆمی بە کاردەبەن.</td></tr>
<tr><td>١٣٧</td><td>جیڤیا</td><td>Givya</td><td>زینو، تازە ئەجوێ ئەجولێ</td></tr>
<tr><td colspan="4">ووشەی جیڤیای ئاوێستایی بە مانای زیندو وە زۆر پڕ مانایە بۆ ئـەوەی</td></tr>
</table>

---

١٨ . بۆ وێنە و نمونە لە هەوەلەوە مرۆڤی کوردی لە بان کانیەکەوە ئاوی خواردۆتەوە و پلنگ هێرشی بردۆتە سەریان یەکیان وتویە پنگ ئیتر نەیتوانیوە بلێ پلنگ هات راکەن، ووشەی پنگی لە دەنگی پلنگ گرتوە کە لە دوای ووشەی پنگی کردۆتە پلنگ یا لە سەر کانیەکان ئاویان خواردوەتەوە یەکیان کە قلەو و چاخ بوە و ئاوەکەش سارد بوە دەنگێکی سورشتی و خودبەخودی لێ هاتۆتە دەرێ ئاو و کە ئاو بۆتە ئاو بۆ ئەو مایەی ژیانە یانی سورشت و کار خۆی کاریگەری هەیە لە سەر رووشە سازی کە عارەبێ لە دەشتی گەرمای عارەبستان دەمی ئاوە بە سەرکانی و ئاوی گەرم کە خۆی ئەو کات لاغەر بوە وەکوو ئێستا کە قەلەو نەبوە کەوتونەتە سەر ئاز و نیعمەتی پارەی نەوتدا، وتویەتی مایی (ماء) کە زۆر مەڕی ئاژالیش دەنگیان وەهایە یا ئەگەر گوێ گری لە دەنگی مەڕ، ماما (ش) هاتوە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| که زیندوو ئەجێڤیێ مردوو ناجوێ، ووشەی جولەی عـارەبیش دەگـونجێ لەمەگیرا بێ، جیڤن، بیشکە جیڤن، جڤاندن یا جواندن ئەجوێ ئەبزوێ و ... هەموو لە بنەماڵەیەکن | | | |
| ١٣٨ | میریشیو | Merethyo | مەرگ، مەرسیە |
| میریشیو لە گەڵ ووشەی مەرسـیەی عارەبیـدا نیـزیکن، دەبـێ ووشـە مەرسیە لەمە گیرا بێ خوێندنی ئەشعاری مەرسـیە بـۆ مردوویـەك یـا شیون کردن ولاوانـەوە، خـۆی میرشـیویە، یـانێ مـەرگ لـە شـیوەن و لاواندنەوەدا ئاشکرا بوە وە بە گوێ کەسان گەیشتوە. | | | |
| ١٣٩ | دەیو | Dahyu | دە - کشودر، ولاّت |
| دەیو یا دێ یا دەتوانرێ بە ولاّت و کشوریش بووترێ بۆ ئـەوەی ئـەمڕۆ بە جیهانیش ئەڵێن دێ کە دەی جیهانی، ئەو کات بە جێگای بەرفراوان و جێگـای بـچووکتر ووتـراوە کـە سەرچـاوەی گەورەکـەش وە ئێـستا گەڕانەوەی پێچەوانەیە. یانێ لە ولاّت و کـشوەر و جیهـان بـۆ لادێ وە دێکەدەی جیهانی. | | | |
| ١٤٠ | ڤەرزا | Varza | گورز |
| پـیتی (گـ) بـە جـێ پـیتی (ڤـ) دانـراوە گـورزی روسـتەم، گـورزی پاڵەوانەکان، گورزەی کەیکاووس، گـورزی گاوسـەر، گـورز و گۆپـاڵ و گورزی کایەی منداڵان کە لە بەن دروست دەکرا و خڕیکیـان دەکێـشاوو یەکی دەچوە ناو خرەکەوە، ئەوجار ئـەوەی کـە لـە دەری خڕکـەوە بـوو گورزی دەوەشان و ئەوەش لە ناو خرکەدا بوو قاوی دەودشان هـەر کـات | | | |

<table>
<tr><td colspan="4">قاوی بدایت گورز دەکەوتە دەستی ئەم، ئەمە گورزان بوو بۆ پیاوانیش گورزانیان دەکرد و کچانیش هەر وەها، خڕ لە زاراوەی ناوچەکەدا یانێ هێڵ و خەت بەڵام لێرددا بە خەتی گاوەسن کە زەوی دەکێڵن هێڵ دەڵێن.</td></tr>
<tr><td>١٤١</td><td>چەخرا</td><td>Chakhra</td><td>چەرخ، عەرەبانە.</td></tr>
<tr><td colspan="4">ناوی چە خرا لە دەنگی سووڕانەوەی ئەو ئامێرە و گەڕانی گیراوە، بەڵام کرکەی ئەم ووشە سەختەرە لە چەرخ کە ئاسانترە، چەرخان بە دەوری خۆیا، چەرخی، زەوین ئەچەرخێ، چەرخە - جێگای مالآت کە گردە) باڵ ئەچەرخێنی، خۆی ئەچەرخێنێ.</td></tr>
<tr><td>١٤٢</td><td>سوخرا</td><td>Sukhra</td><td>سور</td></tr>
<tr><td colspan="4">سورخ و سوخرا و سور، سورخ کردن و سورە و کردنی خواردەمەنی وەکو تەماتە و سێوزدمینی. رەنگی سور، گوڵاڵە سوورە، خوێنی سوور، جامەدانەی سورە سورەوە بوون .</td></tr>
<tr><td>١٤٣</td><td>ئەسرو</td><td>Asru</td><td>سورەبن، سوراوسپیاو و سوورە گوڵ، ئەسرین، فرمێسک</td></tr>
<tr><td colspan="4">ئەسرو، ئەسرین، ئەسرین مەڕێژە، ئەسرین بسڕە، فرمێسک مەڕێژە، چاوت دیشێ ئەسرینەکەی هاتە خوارێ، ئەسرین ناوی کچ و ژنە و ناوی ناوی چاویشە کە لە خۆشیدا یا لە تاڵیدا دێتە خوارێ و دەرێژی بە سەر کونادا.</td></tr>
</table>

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٤٤ | ئەسپا | Aspa | ئەسپ |

ووشەی ئەسپا بە لابردنی (١) بووتە ئەسپ (پیتی ١) لە ئەسپا بۆ رێز و ئیحترامە بۆ ئەسپ کە توانیویەتی بە مرۆڤ خزمەتێکی زۆر گەورە بکات کە هەڵبەت وادیارە ئەو کات هەم بە ماین کەمیەو، ئەسپ کە نێرە ئەسپ ووتراوە کە لە نێوانیان جیاوازی نەبووە و بە یەك ووشە ناوی هەر دووی بردووە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٤٥ | کەرشڤان = کەرشڤان | Karshvan | کشوەر، وڵات |

وادیارە ناوی وڵات ناوی کەرشڤان، وڵات پارێز مەبەستە یانی وڵاتەکە کاتی هەیە و وڵات وان هەبێ و کشوەر کاتی هەیە کشوەر وان هەبێ بەڵام لە دواییدا جێگای پیتەکان گۆردراوە و ئاسانتر کراوتەوە

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٤٦ | کەرشڤەر | Karshvar | کشوەر، وڵات |

لێرەشدا جێگای پیتەکان گوردراوە ئاسانتر کراوەتەوە، کشور داری وڵات پارێزی، وڵات هەڵ سوڕان، کارکردن بۆ وڵات، وڵاتی ئازاد، کشوەری دواکەوتو، وڵاتانی لە روخی گەشەدا، وڵاتانی دواکەوتو. ووڵاتانی پێشرەو. ووڵاتانی جیهانی سێوم، ووڵاتانی لە دوخ و وەزعی گەشەدا.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٤٧ | سرڤەرا | Srvare | شاخدار |

سرڤە رایانێ شتێك لە بانی سەر هەبێ، دەبێتە شاخ و وشەی سەربەخۆیە لە لاشەی گاو و مانگاو گامێش و بزن و بەران، لە حاڵێکدا شاخ خۆی لە سەر رواوە و بەشێکە لەو تەنە بەڵام بۆ ئەوەی بانی سەری مرۆڤ کە دەبێ کلاو، جامەدانە، رەشتی و سەروێن و ... بێت لە یەك

| | | | |
|---|---|---|---|
| جویَ ببنەوە شاخ ووتراوە. | | | |
| ١٤٨ | هوزاتا | Haozatha | هاوڕیَ ، هەم زات |
| هوزاتا = هوزیش کە تاکەکانی هاوڕیَ پێکەوە هەن لە مەیە، ووشەی هۆزمانای کۆ دەگەیێنیَ، کاتێکە هەم زاتیش بیَ کۆیە بۆ ئەوەی لە زمانی کوردیدا (ئاریاییەکانیش) دوان (بە پێچەوانە عارەبی کە دونابێتە کۆ و جەم. | | | |
| ١٤٩ | ئایانها | Ayanhe | ئاسن - ئاهەن |
| لە ئالَ و گۆڕ کردنی پیتەکانی ئایانها بە ووشەی ئاهەنەوە نیزیکە تا ئاسن کە هیچ نزیکایتیان نیە لە مانای ئایانها و ئاهەن هەر دو مانای بوون هەیە، لە سەردەمی ئاڤێستادا ئاسن یا ئاهەن بوونی هەبوە. کە دەورە و سەردەمی ئاسن دەورێکی گرینگی لە ژیانی مرۆڤدا گێڕاوە. | | | |
| ١٥٠ | زەرانینا | | زەڕین |
| ئەم ووشە بە کەمیَ گۆڕانکاری ولابردنی پێی (١) بوەتە زەڕین بە ریزی ٨٧ بڕوانە . | | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ریز | | | کوردی |
| ١٥١ | ثری تئونە | THRAETAONE | فریدون |
| ووشەی ثری یاتری تئونە بۆ فریدون پاوشای کیانی کە کورد بوە و دایکی فرانەك و باوکی ئابتین لە تەهمورس کورد بوە و نژادی شایی | | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| هەبوە کە کاوە، ئەوی کردۆتە پاوشا و زوحاکیان و زوحاك تازی (تاجی) عارەبی بۆڕداوە ووتراوە. | | | |
| ١٥٢ | مەتران | Mathran | پێغەمبەر |
| مەتران بە قەشەکان دەوترێ، ووشەیێکی ئاوێستایی یە بە ریزی ٩٦ بڕوانە. | | | |
| ١٥٣ | ڤێهرکانا | Vehrkana | گورگان |
| کە لە کەتیبەی بیستوندا هاتوە، وە هەرکانا کە بە خەتی بزماری نووسراوە کە گورگانیش خۆی بەشێك بوە لە ولاّتی ژێر رەکیفی داریوشی هەوەڵ کە بە حیلە ئەسپەکەی و فێڵی مەیتەرەکەی بوو بە پاوشا، گورگان ئێستا شارێکە لە پارێزگای گولستانی (ئیران) تول جوغرافیا ٢٦ - ٤٥ و عەرزج ٥٠ – ٣٦، بەرزی لە پانتی دەریا ١٦٠م، جەماوەری ٤٢٨/٢٧٦ کەسە دو ناحیەی هەیە. | | | |
| ١٥٤ | ئاهورانی | Ahurani | کچی ئاهورا |
| کچی ئاهورایی، کچانی جوان و باش، هەرچ لە کاتی گەشەدا جوانە چ چوزە گیا، پونگە، ودار، بەرخ تەنانەت گوێرەکە و ... تا دەگاتە گیان لەبەری فراژ و کامل وەکوو کچانی گەنجی جوان و .... بێ پاساونیە کەفەلەکان وتوویانە مەریەم کچی خوایە وە لە یونانیشدا کچانێ کە زئوس لە کچی تیتانیەکان بویە و خۆشی خوای خوایان بوە کچانی خودان. | | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٥٥ | ئەهورایی یا ئاهورایی | Ahuirai | ئاهورایی |
| خودایی، شتی بێوێنە، لایەن گری ئاهورا، لایەن گری چاکی و دژی ئەهریمەن | | | |
| ١٥٦ | زەراتوشتری | Zarathushtri | زەرتەشتی |
| زەردەشتی پەیڕەوی زەردەشت پەیامبەری کوردەکان کەسێ پەیامبەریان هەبوە بەم ناوە، زەردەشتێ مەهاباد زەردەشتێ ئازەر هوشەنگ، زەردەشتی پورشەسپ، و ناوی زەردەشت زۆر باو بوە و برێك وتویانە کوردەکان ١٥ پێغەمبەری بەناوی زەردەشتیان هەبوەکە دیارە بابەتەکەی شاری سنەش ئەمەی نیشاندا کە نێوی ئەو پەیکەرەش زەردەشت بو. | | | |
| ١٥٧ | راجی | Raji | رازی – ئەهلی راگا یا رەغە |
| رەی، رەغە ناوەندی زۆربەی میدیاکان (کوردەکان) بە تایبەت کاتی خەباتی فەروەرتیش لە گەڵ داریوشی هەخامەنشیدا، شاری رەی ئێستا لە بەشی پارێزگای تارانی ئێران دایە لە ٢٦ – ٥١ پلەی جوغرافی و عەرز ٣٦ – ٣٥ پلە بە بەرزایی ١٠٦٠ م لە پانتایی دەریایە. | | | |
| ١٥٨ | پیرێنین | Perenin | دارای پەڕ = باڵندە |
| پێرنیان یا پەرنیان یەکەن کە ئێستا بەشێك پەری لە نێودا بێپەڕنیانی پێ ئەڵێن، باڵندە کە هەمو تەنی پڕ لە پەڕە با شتر پەرنیانە. | | | |
| ١٥٩ | دروجین | Drujin | درۆزن، ئەهریمەن |
| درۆزن، دروغزەن، درۆ — درۆ کردن کاری ئەهریمەنییە و دور لە ووتاری | | | |

چاکە، کەسێکە درۆزنە بیری چاکی نیە و کردەوەشی خراپە، ئەمە لە ڕیزی ئاهوراییی دەچێتە دەرێ بەلاّم لە ئایینی دیکەدا هەزاران درۆ دەکات، خەلّك دەکوژێ، دزی دەکات و ئالودەیە هێشتا لە ڕیزی لایەنگری الله نەچۆتە دەرێ، ئەمە جێگای سرنجە و جێگای سەرسوڕمانە!!

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٦٠ | میشینی | Meahini | میشی - مەڕی |

زۆر لەو ئاژەلّدارانە کە خۆم دەیان ناسم زۆربەی جافەکان و شێخ سمایلیەکان هەم مەڕ دەلّێن و هەم مێش، ئەم ووشە لە گەلّ ووشە مەشیەو مەشیانە (ئادەم و حەوا) ڕیشەیان یەکە، بۆ ئەوەی مەڕ جێگای ڕیزە و داهێنەر و زۆر سوودی هەیە بۆ مرۆڤ.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٦١ | نەیری | Nairi | ژن، نیشانە، ژەنی |

نێر یانی پیاو بەلاّم نەیری بۆتە ژن، ژن، مێ، ژیان، ژینگە، براژن، ئامۆژن، ژن خوشك، ژنی باش، ژنی سەروێن لار، ژنی پزیشك، ژنی هونەرمەند، ژنی ڕاوێژکار، شاژن، ژنی شا، ژنی خزم، خزمی ژن، کێو و زەویش کە بەرهەمی هەیە ژنە شالیاری ژن، خوای باران و کشت و کالّ ژنە. خوای ڕۆبارەکان ئاناهیتایە. جا ئەوەتا دەبێ بزانین نەتەوەی کورد زۆر ڕێزی داناوە بۆ ژن کە ژن بۆ خۆی خودایە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٦٢ | درەفشاکا | Drafshaka | درفش، درفشی کاویانی |

ئالاّ پەرچەم، ئەو چەرمەی کە کاوەی ئاسنگەر کردبویە پێش بەند لە

<table>
<tr><td colspan="4">دوایدا بوه پەرچەمی ئێران کە پەرچەمی پاوشایانی کیانیش بوو. کنون کرد از آن تخمه دارد نژاد یانێ ئێستا بە ووتەی فیردەوسی کورد لە کاوەی ئاسنگەرە بە ریزی ۸۴.</td></tr>
<tr><td>۱۶۳</td><td>مەشیاکا</td><td>mashyaka</td><td>مەردە، مەردەك</td></tr>
<tr><td colspan="4">پیتی (ك) نیشانەی بچوکردنەوەیە کە مەشیە دەبێتە مەرد — نێر و مەشیانە ژن و مێ و نەیری بەڵام جیاوازی لەوە دایە کەمەشیە و مەشیانە هەوەڵین نێر و می فراژن و بوونەتە بناغەی زاوزێ بۆ مرۆڤ، ناوی ئادەم و حەوا کە خۆی مانای زەوین و ژیان دەدا لەم ئیدە گیراوە. بە ریزی ۶۲ بڕوانە.</td></tr>
<tr><td>۱۶۴</td><td>نەیریکا</td><td>Nairike</td><td>مؤنث ، نەێری، ژن،ژنەکە</td></tr>
<tr><td>۱۶۵</td><td>پەریکا</td><td>Pairika</td><td>پەری</td></tr>
<tr><td colspan="4">لێرەشدا (ك) نیشانەی بچوك کردنەوەیە.<br>پەری لە بیری لەمێژینەدا ئەوە بوو کە دیوو پەری و جن (عارەبی) یا عفریت عارەبی هەبوە و لە قورئانی پیرۆزیشدا جن هەیە، بەڵام مانای ئەمانە چیە[19] هەموو ئەومرۆڤانە هێشتا لە جێگایێکی تایبەت</td></tr>
</table>

۱۹. ئەوەندەی کە عارەبەکان وتویانە: الاکراد طائفه من الجن بۆ ئەوەی کە بۆ ئەو عارەبانە کە لە لای کوردەکاندا نیزیکیان هەبوە لە کاتی شەودا گورزی خۆیانیان لە عارەب وەشاندوە. بەیانی هیچ شوێن پێیەک لە کوردەکان وەدەست نەکەوتوە، جن و جنین، ئەوەی لەبەر چاو نیە بەم ناوە بە ناو بانگە، ئەوەی کە ئەردستو لە جنّ تەعریفی کردوە، لە چەمکی نووسەردوە ئەو ماناکەی ئەزانیوە وە ئەیزانیوە.

<table>
<tr><td colspan="4">دانەنیشتبوون یانە ناسراو بوون وە لە دەوروبەری شارەکان و لادێ کاندا بوونە، جن ووتراوە ئەوەی کە جوان بوە پەری و ئەوەی کە ناشیرین وز لەو رەش و نالەبار بوە دیو یا عەفریتە ئیتر ووتەی ئەفلاتون و ئەرستو لەم بارەوە بە هیچ کلۆج راست نیە.</td></tr>
<tr><td>١٦٦</td><td>کوتاکا</td><td>Kutaka</td><td>کودەك، بوچك، ورد</td></tr>
<tr><td colspan="4">کودەك منداڵ، بچوکە کە لە فارسی دا هەیە کە ریشە ووشەکانی فارسی جگە عارەبیەکان هەر کوردیە و لە زۆر زاراوەی کوردیشدا کۆ دەك دەڵێن و کوتەك کە منداڵ دەبێتە دارە دەستی دایك و باوك.</td></tr>
<tr><td>١٦٧</td><td>خوشماکا</td><td>Khushmake</td><td>لە شوما، جە شوما</td></tr>
<tr><td colspan="4">ووشەی خۆشی و خوشما کە زۆر نیزیکن پێکەوە، بەڵام لێرەدا وا دەگەیینێ کە مانا دژی هەیە بەروالەت ئەم ووشە دەبێتە کینایە و توانج کە دەڵێن کابرا کە پیاوێکی ستەم کارە دادگەر، عادڵ، شوم بەشتی بەد یومن دەووترێ.</td></tr>
<tr><td>١٦٨</td><td>ئەهماکا</td><td>Ahmaka</td><td>لەمە لە ئێمە</td></tr>
<tr><td colspan="4">گۆڕانکاری زۆری ویستوە تا ئەهماکا بووەتە ئێمە و یا لە ئێمە و یالە مایا ئەزما هەموو جۆرێك بڵێن دوای تاشین ریش و سمێڵەکەی ئەم ووشە، بۆتە لە ئێمە.</td></tr>
<tr><td>١٦٩</td><td>ثریتا</td><td>Thrite</td><td>سێوم کەس</td></tr>
<tr><td colspan="4">من[١]، تەیاتۆ[٢] ئەو[٣] (تاك)، ئێمە، ئێوە، ئەوان (کۆ) بەڵام لێرەدا گەرچ ووشەی تا هەیە دەبوایە کەسی (دوهەم بێ بەڵام لە شرۆڤەکەدا ووتراوە</td></tr>
</table>

<table>
<tr><td colspan="4">کەسی سێوم، نووسەر لە سەر ئەوەیە کە ئەم ووشە بۆ کۆی کەسانی دوهەمە کە تای تێدایە یانی ئێوە، شوما.</td></tr>
<tr><td>١٧٠</td><td>ڤیساستیما</td><td>Visastema</td><td>بیستم</td></tr>
<tr><td colspan="4">ژمارەی تەرتیبی بە زاراوەی هەورامی نیزیکە کە ناتەرتیبەکەی دەبێتە ویست یا ڤیست هەورامی کە ئاوێستاییەکەی ڤیساسیتمایە، کە لەم ووشە بستمی لێ تاشراوە دارتاش کە خۆی لە بنەرەتا قورسی و سەندەلی و درگا و دەر و پەنجەرە دەبێ بتاشێ.</td></tr>
<tr><td>١٧١</td><td>سەتوتێما</td><td>Satotema</td><td>سەتم</td></tr>
<tr><td colspan="4">ئەمەش لە سەتا سەتو ساز کراوە بە زیادی چوار چێوە پێوەلکاوە، ئەوجار ئەم ووشەش تاشراوە و رێك وپێك بوە و بۆتەسەدم یاسەتم کە ئاسانترە بە ریزی ٤١بڕوانە.</td></tr>
<tr><td>١٧٢</td><td>هازاروتێما</td><td>Hazaotema</td><td>خوارزم</td></tr>
<tr><td colspan="4">ئەم ووشە، جگە لە خوارەزم دەتوانێ مانای هەزارمیش بێ بو ئەوەی خوارەزم خۆی یانی هەزاردم کەرەزم و خەباتی زۆر کردویتە خوارەزم و ماناکەی چۆتە سەر و بە خوا کە پلەی سەری هەبود گەیشتوە کە پیتی (خ) زۆر بە جێگای (هـ) هاتوە خوزستان، هوزستان.</td></tr>
<tr><td>١٧٣</td><td>ئاپاراتەت</td><td>Uparatet</td><td>بەرتەری ئاپاراتایت</td></tr>
<tr><td colspan="4">ووشەی ئاپارتایت لە لاتینا بۆ جیاوازی نژادی و جنسی و ... ئەوترێ ئافریقا باشور لە پێشان رەژیمی ئاپارتایت بوە ووشەی ئاپارتایت لەم</td></tr>
</table>

| | | | |
|---|---|---|---|
| ووشە گیراوە. (هیند و ئوروپی). | | | |
| ١٧٤ | خشڤەشی | Khshvashti | شەست (٦٠) |
| بە ریزی ٢٧ بڕوانە، ووشەی شەش سانسکریت ئاسانترە تـا ئاڤێستایی وادیارە چینگرەنگهاچە یا ئەوانەی کە لـە ئاریایـەکان بـە هیندوستان کۆچیان کردووە لێرەدا زۆرتر کاری دارتاشیان ئەنجام داوە (یـانێ ووشـە ساوین). | | | |
| ١٧٥ | هەپتایتی | Haptaiti | هەفتا، حەفتا (٧٠) |
| وشەکەی لە ژمارەی ٣٧ هەیە بەلاّم ئاڤێستایی وەکوو سانسکریت نیـە کـە بـە جـێ پـیتی (هــ) ئاڤێـستا (س) بکـار دەباسـەپتایتی ٧٠ی سانسکریت. | | | |
| ١٧٦ | هەپتاتا | Haptatha | هەفتم- حەوتم |
| بە ریزی ٣٧ بڕوانە کە ووشەی ئاڤێستایی نیزیکتر لـە سانـسکریت بـە کوردی ئەمڕۆیە. | | | |
| ١٧٧ | پوخدها | Pukhdha | پنجەم |
| بە ریزی ٣٦ بڕوانە کە ووشە سانسکریتە کە بـە کـوردی و بـە بناغـەی ووشەکەوە (ئاڤێستا) نیزیکترە چونکە لە ئاڤێستادا بۆ ژمارەی پێنج یا پەنج پەنجە ووتراوە بەلاّم بۆ پنجەم پوخدا ووتـراوە دەگـونجێ لـە کـاتی کرکەی ئەم ووشەیە، هەڵە رووی دابێ پونچەهـا بـێ نووسـەر لـە سـەر ئەوەیە کە دەبی پونچە هابێ. | | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٧٨ | خایانا | Khayana | کاریز - چاه |
| لە چەمکی نووسەرە وە خایانیّ خاك و یانا یانیّ مالّ مـالّی نێـو خـاك دەبێتە چاه بەم جۆرە ناوی کارێز (کونا لەکێـو) بۆتـەخایانا یـا خـودی خایانایانیّ خانە مالّی ژێر زەوین. | | | |
| ١٧٩ | زارایانا | zrayane | زری = دەریا زەرێوار |
| وەکوو دەریا، مالّی ئاو، یانەی ئاوی دەبێتە دەریاکە ئاو لەوێدا قـەتیس دەبیّ، زریواری مەریوان کە ووشەی مەریوان لە مەڕوان ساز کراوە خۆی دەبێتە وانی مەڕ، وان = دەریا = مەڕ جۆرە بەردێکە لە ئەشکەوت، وان لە تورکیادا، ئەگەر ببی بە کۆتر بچیتە بن مـەڕ دەبم بـە بـاران سـەرگۆنات ئەکـەم تەڕ.[20] | | | |

---

٢٠ . ئەوەی کە خۆی بە سەگ و خوگ دەگۆری هەر ئینسانە و مرۆڤە کە ئەگەر ئەمرۆ ئەرەستوو هەبوایە و تەلەفیزیونی بدیبایە. دەیزانی کە نەیزانیوە کە ئەگەر مرۆڤ دو دەستی لە زەوین دانێ و وەکو گیان لەبەری چوارپیە جا ئەگەر پێستی سەگ یا خوک یا ورچ لەبەر کات و برێک جار لە سەر پێان بوەستێ هەموو گیان لەبەران دەترسن و رادەکەن. نووسەر بۆ خۆی بۆ گورگ و بۆ سەگانی لادێ لە کاتی شەو بۆی هاتوون بە دانانی دو دەست لە زەوین بێ ئەوەی پێستی ئەو دەرندانەش لە بەرکا هەموو ئەو گورگ و سەگە هێرش بەرانە رایان کردوە بە راستی کە ئەگەر هەر گیان لەبەرێک وێنەی رەسەنی خۆی بگۆڕێ ترسناکە، بیستوومە لە شاری سنەدا شێخێک هەبوە کە ناوی نابەم بۆ ئەوەی کرامەت پیشان بدا یەکێ لە دەروێشەکانی رۆژانە لە نێوی پێستی خرتی گەورەدا (بزنی نێر) لە ژێر خانەکەدا داینـاوە هەر کات کەسێ هاتوتە لای مام شێخ. ویستوویە نینکاری بکات یا قسەی هەلیت پەلیت بلێ، مام شێخ بە کێشانی تەنافی ژێری

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٨٠ | ئایریانا | Airyana | ئاریایی |
| ئێران و ئایریانا و ئاریایی، ئارین، ئاروین، ئارتینا، ئارشینا، ئارسینا و ئورمیە (ئاوورمیدیا) و ئورشلیم (ئاورسەلیم) هەموو بە ئار، ئاگر و ئاور و ئاتر و ئاوری دەست پێ دەکا، ئاهوراش لەم ووشەیە ئێران دەبێ ئایران یا ئایریان. | | | |
| ١٨١ | سپیتاما | Spitama | بنەماڵە زەردەشت |
| بنەماڵەی تۆمی سپی (پاك) کە دژی رەش و تاریکن کە زەردەشت خۆی لایەن گری پیرۆزی رۆشنایی بە سەرتاریکیدایە کە زەردەشتی سیوم کوڕی پورشەسپ کوڕی کەیدار کوڕی ئارپاك، کوری مامیر کوڕی هەزپان، کوری ئیسپیتمان (سپیتامە)یە. | | | |
| ١٨٢ | نوما | Nauma | نویوم نۆهەم بە ڕیزی ٣٩ بڕوانە. |
| ١٨٣ | زاتوما | Zatuma | لەتیرە، لە تۆم |

دۆشەکەکەی دەرویشی نێرە بزنی ناساندوە کە نیشی خۆی ئەنجام بدات ئەم جار دەرویش بەو قەڵافەوە هاتۆتە خزمەتی شێخ پیاوی مونکیر کە چاوی بەم جۆرە قەڵافە و چەشنە و وتە کەوتوە بێ درەنگ لە هۆش چوە و کەوتۆتە سەر زەوین بەڵام رۆژێک لە رۆژان پیاوێکی ئازا دێتە خزمەتی شێخ و ئەم کەڵە پیاوە رووداوە کە ئاشکرا دەکات و خەنجر لە دەرویش کە لە پێستی بزن دابوو، دەکێشێ و دەرویش دەدا بە زەویدا و دەی- هەوێ بیکوژێ بەڵام دەرویش هاوار دەکات تو خوا مەم کوژە من دەرویش مەحموم وام کردوە لە خۆم کە هەڵبەت من بۆ خۆم دەرویش و شێخ وەکوو مرۆڤێک بویان ریز دادەنێم بەڵام ئەمەم لە زۆر پیاو ماقولی شاری سنە بیستوە بۆ ئەوەی کە بڵێم: ئەردستو کەوتویە جن خۆی بە چەشنەکانی جۆراوجۆر دەگۆڕێ تەنانەت بە سەگ و بەرازیش بەڵام نەی ووتوە ئەمانە هەر ئینسانن وا دەکەن بە خۆیان .

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٨٤ | ئاریامەن | Airyaman | بنەماڵەی ئاریایی |
| کوردەکان، فارسەکان، ئەفغانیەکان، (هیپتالیان) و تاجیکەکان و ... لە بنەی ئاریان. | | | |
| ١٨٥ | خشاتریا | Khshathrya | شاهانە |
| بە ریزی ٥٩ بڕوانە | | | |
| ١٨٦ | یەسنیا | Yasnya | ستایش |
| بەشێك لە ئاوێستا بە ناوی یەسنا لەم ووشەیە کە ئاڤێستا خۆی گاتەکان و یەشتەکان و یەسناکانە، و هەر وەها زەند و پازەند و ڤەندیدادیش بە ریزی ١٠٠ بڕوانە. | | | |
| ١٨٧ | گاویا گاڤیا | Gaoya Gavya | گا، گاوی، لە گا |
| بە ریزی ١٢٥ بڕوانە | | | |
| ١٨٨ | ئەهورا | Ahura | خودا، ئاهورا |
| بە ریزی ١٥٤ و ١٥٥ بڕوانە. | | | |
| ١٨٩ | هەپتا کارشڤان | Hapto karshvan | هەفت کشوەر |
| بە ریزی ١٤٥ بڕوانە کە بە حەوت و وڵاتی ئاریایی ئەو کاتە هەپتا یا هەپتوکارشڤان ووتراوە. | | | |
| ١٩٠ | ئافریڤانا | Afrivana | ئافەرین |

ئافریڤانا پەسن و ستایش و یەسن و ستودن بە ریزی ١٠٠ و ١٨٦ بڕوانە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٩١ | فرازانیتڤانت | Frazaintvant | دارای فەرزەند |

ووشەکە لەکاتی کرکەدا مانای دارای فەرزەند دەدا، کە ووشەیەکی تێکەلاّویە کە وادەر ئەکەوێ ڤانت ووشەی مالکیت بێ، فرازانیت خۆی بە تۆزی تاشین دەبێتە فەرزەند.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٩٢ | نەیری ڤانت | nairivant | دارای هاوسەر، ژن |

نەیری ژن، مێ ڤانت = دارای ، خاوەن، ژنی هەیە، کەسێکە ژنی هەبێ لە زاراوە ئاڤیستایی بە جێگای دارای، خاوەن ڤانت ووتراوە.

**کرکەکانی ووشەکانی تێکەلاّو.**

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٩٣ | داریغو بازو | Dare gho Bazu | درێژ بازو |

داریغو = درێژ بازو هەر ئەو بازویەی ئێستایە، بازوی درێژ خۆی پەسەند بووە کە لە تاریفی پێغەمبەر ئیسلام دا، بڕێک لە موسوڵمانەکان ووتویانە دەستی وە پاوە دەگەییی تا ئەژنۆ.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٩٤ | هڤنەسپا | Huaspa | دارای ئەسپی باش |

هو یا هڤ وادیارە کە ئەگەر لە هەوڵی ووشەدا هاتبێ مانای چاک کردەوەی چاک وەکو هومەتە، هورەختە، هورشتە یانی بیری چاک، ووتاری چاک و کردەوەی چاک بۆ ڕیزی ١٩٨.

| | |
|---|---|
| ١٩٥ | ئاروش ئەسپا ماناکەی مەبەستە کە ئار ئاگر، وەش، خۆش، |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | باشی، کە ئەسپی سپی باش بووە کە خۆشرەنگە، یا بە زاراوەی هەورامی ئاروش یانیٚ هێنان مالکیەتە. | | |
| ۱۹۶ | ئەسو ئەسپا | Asuaspa | ئەسپی توندرەو لە ئاو دەرهاتو. |
| لە زبان و زاراوە کوردی ئەمڕۆ ئەووتری ئەسو یانیٚ ئاوساویە و لە ئاو دەرهاتوە و ئەڵێن ئەو شتە ئاسوبوتەوە یانی لە ئاو دەرهاتوە. | | | |
| ۱۹۷ | دوژیادوش کێرێتا | Dushkereta | کار و ئیشی خراو و بەد |
| کێرێتا دوای تاشین بوتە کار، دوژ یا دوش لە هەوەڵ هەر ووشەیە کە وە هەبێت مانای خراپ و پەت دەدا وەکوو دۆژ یا دوش مەتە... یانیٚ بیری خراپ بەڵام ئەگەر هو هەبیٚ ماناکەی دەبێتە باش. | | | |
| ۱۹۸ | دوژیادوش‌چیتر | Dushchithra | نژادی خراو، نژادی بەد |
| یا پەت بە ریزی ۱۹۷ بڕوانە | | | |
| ۱۹۹ | دوزوختو | Duzukhtu | ووتەی خراپ سوخەنی بەد |
| بە ریزی ۱۹۷ دوژمتە یا مەتە دوژرشتە دوژنگە وتاری خراپ و کردەودی خراپ دەبێتە تاریکی موتڵەق دوژەنگە، قاتی ژێری دوزدخ | | | |
| ۲۰۰ | دوزدینا | Duzadeena | بەدسوخەن، خراپ ووتە |
| بە ریزی ۱۹۹ و ۱۹۷ بڕوانە | | | بەد ویژدان |
| وا دەرنەکەویٚ، خودی ویژدانیش دین و دنیا ژمێردراوە هەر وەها ئێستا | | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەڵێن ئەگەردینی نیە ویژدانی بێ و ... | | | |
| ٢٠١ | هەزانراگاشا | Hazanra gasha | هـەزار گـوێ، هـەزار گوش |
| زۆر شنەوا، ژنەوا، هەزار گوێ و بۆ یەکی لە خودایان ئاریایی وا بزانم بۆ میترا و وتراو: هەزار گوێ و هەزار چاو یا زیاتری هەیە، موبالّەغەیە لە ئاگایی و زانیندا. | | | |
| ٢٠٢ | هڤداتا | Hvaeta | خوا خۆ بە خۆفەرمانرەوا |
| | خۆی دادوەر | | دانـا و دۆتایـانێ پەیامبـەر و دادوەر یـانی فەرمانڕەوا دەبێ دادوەربێ، لـە ووشـە کـەدا ئەندەرز و نەسیحەت هەیە، زۆر گرینگـە کـە فەرمانرەوا مەرجی دادوەریە. |
| ٢٠٣ | نەیرێ مەناە | Naiemanah | مەردمەنش، نەریمان |
| نەیری لە پێشان لە ریزەکانی پێشودا هاتبو بە مانای ژن بوو ریزی ١٦٤ و ١٦١ ئێستاکە بە ووشەی مەناوە لکاوە بۆتە پیاو، نێـر یـا مـەنش و خۆ، دەبێتە پیاوی خومەنشی ژنانە کە باوکی سامیش نـەریمـانی نـاو بوە سامی نەریمان، یانێ ژنانە رەنگ. | | | |
| ٢٠٤ | دینودیزا | Daeno disa | مامۆستای دینی، ئایینی |
| ئاشکرایە ووشـەی دیـن یـانێ دوبـارە چـاوپێکەووتن (رۆژی ئـاخردت) ووشەیێکی کوردیە و ناوچە دینەوە ریادین هاودرکە بە ناوی زەردەشتە و خورپەی دوهەمی لەوی بۆ هاتوە ئاگرکایی وا لە بـانی کێـوی هـۆگر و | | | |

<table>
<tr><td colspan="4">ئاسەواری هێشتاماوە دیزا مامۆستایە کە دەرزی دینی داوە.</td></tr>
<tr><td>٢٠٥</td><td>مشت مازاە</td><td>Mushthmasah</td><td>بە مەزنی مشت بە گەورەیی مست</td></tr>
<tr><td colspan="4">مشت یا مست هەر ئێستاش دەووترێ، مازا یانێ مەزن = گەورە ووشەی مازەندەرانی ئێران و دەریای مازندەرانیش هەر لەم ووشەی مەزنە دایە یانی گەورە، دەرەکانی گەورەکە دەرخۆی زاراوەی هەورامیە یانی دۆڵ و چەم و دۆڵ.</td></tr>
<tr><td>٢٠٦</td><td>بازوش ئوجاە</td><td>Bazushaojah</td><td>دارای بازوانی توانا</td></tr>
<tr><td colspan="4">لە ریزی ١٩٣ دا داریغو با زوو ، وترا، لێرەدا با زوش ئوجاە، ئوجا یانی تەوانا و بە قودرەت (ش) نیشانی مالکیت و بە مانای دارایە ووشەی ئوجالانیش لەم ووشەیە یانی جێگای بەرز.</td></tr>
<tr><td>٢٠٧</td><td>گاویائویتی</td><td>Gaoyaoiti</td><td>لەوەڕگەی گا، چراگەی گا</td></tr>
<tr><td colspan="4">گاو یا گاویا، کاو یا گاڤیا ( بە ریزی ١٢٥ و ١٨٥ بڕوانە) هەر بە مانای گایە چی نێر و چ مێ (مانگا) ئویتی لەوەڕگەیە کە ئەو لەوەرگە، ناوی هەبوە لە ئەسڵ دا یانی مێرگ لە ووشەکەدا باش دەر ئەکەوێ کە زبان ووشە ناسی یانی ئەمە، نە مەلاّ قولی هەرچ بلێ کە ئەوەی راستە نە، نە.</td></tr>
<tr><td>٢٠٨</td><td>ریڤات ئەسپا</td><td>Raevat Aspa</td><td>دارای ئەسپی چاك و خاس</td></tr>
<tr><td colspan="4">ووشەی ئەسپا ئاشکرایە کە پیتی ئەلف لابراوە و بۆتە ئەسپ، وات یا</td></tr>
</table>

| | | | |
|---|---|---|---|
| وانت لە زبانی ئاوێستاییدا یانێ دارای، رێ هەر رێیە ئەسپێ کە رێگا بڕێ ئەسپی چاکە. | | | |
| ٢٠٩ | بە کۆ دەبیتە دارای ئەسپی خاس کە رێگا دەبڕی بە ریزی ١٩٣ و ١٩٤ بڕوانە کە ڤانت نیشانەی مالیکیەتە. | | |
| ٢١٠ | ڤێر دات گیتا | Varedatgaethe | ئافەریننەدەی گیتی |
| ڤێر + دات دەبێتە ئافەریننده گێتا هەر ئەو گیتیەیە کە ووترا = ئافەریننەدەی جیهان، گیتی بە ریزی ١٠٠، ١٨٨، و ١٩٢ بڕوانە بەلام ئەو ووشانە لە گەلّ ئەم ووشەدا جیاوازن هەر چەند ئافەرین وەکوو ئەم ووشە وەهایە. بەلام ئەو ئافەرینە ووشەی داتی لە گەلّدا نیە، دات بۆ خۆی داهێنەرە بە ریزی ١٣٦ بڕوانە. | | | |
| ٢١١ | دیوجەن | Daeumgan | دیوزەن، دیوکوژ |
| دێو هەر ئەو دێویە کە لە ریزی ١٦٧ دا وتم لە مانای پەری‌دا، لێرەشدا دەلێم دێو هەر ئەو دێو، جەن یانێ کوژەر، تێکڕا دەبێتە دیو کوژ، ناوی کەروی تێکەلّە، دێوکوردی - عفریت عارەبی، نالەبار نە پوخت و ترسێنەر دەبێتە دێو = ئەگەر لە پێشان سپی پێس ناوچە ئاسیا ردش پێسی سودانی نەدیبێ لە بەرچاوی دیو بوود. | | | |
| ٢١٢ | هویکێریتا | Hubkereta | خوش کردود، باش کردار |
| بە ریزی ١٩٩ بڕوانە. | | | |
| ٢١٣ | ئەرشوخدا | Arshukhda | خوش ووتە |

ئێستاش بە کەسانێکە قسەیان خۆش بێ دەووترێ فلان کەس شۆخە، شۆخی دەکات، گاڵتە دەکات قسەی خۆش دەڵێ ئەریائار = هێنەر، شۆخدا داهێنەری شۆخی و گاڵتە ماناکەی ئاشکرایە مامۆستا خۆت مات مەدە بۆ رەخنە باشتر لەوە نازانی - کە پیتی (دا) خۆی تەکمیلی داهێنەرە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢١٤ | پەنچە یوخشیش | Pancha yokhshtish | پەنج شاخ |

**یوخشیش بە ریزی ١٤٧** بڕوانە لەوێدا سەرڤەرایانی شاخدار لێرەدا پەنچە **پنج یا پەنچ یوخشیش یانێ شاخ پێنج**، شاخی ئەو، ئایا بە جێگای ٢ **شاخ پنج شاخ هەبووە** وەکوو ئەسپی پنج پا کە لە سەرەتای ژیانی زۆر **لە گیان لەبەران** ئەندامی زیادی هەبووە لە دواییدا بە هۆی سازش کە **لە گەڵ** ژینگەدا تەکامولی بۆە وزیاد یە کانی لابراوە، یا پێنج شاخ مەبەستی لە دارێك یا گیایەك یا کێوان بێ یا گەوەزنی ئێستا.

بە بیری مامۆستا بڕوانە کەچی دەڵێ کە زانکۆشی دیوە و بەلاّم فراژی قەبوڵ نیە و ئەڵێ جیهان هەر وەها بوە و بە هیچ کلوج گۆڕانکاری نەدیوە!!![٢١]

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢١٥ | پەیتی ئەپێم | Paitya pem | دژی ئاوی رەوانی جۆگا |

لە رووی جۆگا، ئێستا بیرم نایگاتێ دروشم لە کیرفاندا نیە بەلاّم

دەگونجێ بلێین (پەیتی) یانێ پێ، پا، (ئە) یانێ ئاو (پێم) یانێ پێوان ڕۆیشتن بە تێکڕایی دەبێتە دژی ئاوی ڕەوان مەلە کردن = خیلافی ڕاستی ووتن یا کار کردن کە پێ زۆربە بزاڤی کارە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢١٦ | هواسرا | Huwasra | هەسرو دایکی ژن |

لە زاراوەی هەورامیە دەوڵەمەنەکەی خۆماندا کە لە کاتی گەنجیدا فێری بومە هەسروە یانێ خەسو دایکی ژن بەلاّم هەزورە یا هەسورە باوکی ژنە کە دەبێتە خەزووری ئەردەلاّنی و سۆرانی و ... هەسروە = خەسو = دایکی ژن و هەزورە یا هەسورە - خەزوورە - باوکی ژنە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢١٧ | پتور یا پتەر | Ptar | باووك |

پتور یا پتەر یا پدەر باوکە، کە لە کوردیدا هەموو دارای باوکن بەلاّم لە شوێنیترا ئەگەر پدەری میللەت ئێن بێ پدەر بود... بایەد... کە لە ئینگلیزیدایە دەبێتە فازێر، کە هیند و نوروپی، زۆر ووشەی هاوبەشیان هەیە وەکوو لاق = لیگ، لێو- لەپ، ڕەت بەردەت = تەڵە، پانتۆڵ = پانتۆڵ وە دەیان ووشەی دیکە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢١٨ | وەش پایتی | Washpauiti | کاوان، کابان، گەورەی ماڵ |

وەش = خۆش، پایتی = قەدەم = پا، پێ خۆش قەدەم کە دەبێتە کاوان گەورەی ماڵ یا کابان مەڕی دەدوشی کە گەورەماڵیش هەر خۆیە، ژن و ماڵ کە ئەگەر ژن نەبێ ماڵیش نیە یا کەڵکی نیە، ژن لە فەرهەنگی ئاریایی و ئاڤێستایی سانسکرتیدا زۆر پڕ بایەخە، هەرچەند مامۆستا ڕقی بێ لەم ووتە بەلاّم وایە ئاخر خۆشم مامۆستایی دینیم. نە بەو

| | | | |
|---|---|---|---|
| جۆرە کە تۆ دەماروی موبارەکت بۆ عاردبە. | | | |
| ٢١٩ | تاوکمە، تاوخمە | Tawkhmah | توخمە |
| نژاد بە ریزی ١٢٨ بڕوانە. | | | |
| ٢٢٠ | پوترا | Potra | پور، فەرزەند |
| پور بە زاراوەی دیویسنی هەنوو یا هەنەزا، فەرزەندی باوە پیارە منداڵی شۆی دایکی، ژن یا پیاو، کچ یا کوڕ هەر دوو کە لە دایکیترن هەنەزا بە زاراوەی ئەردەڵانی، ئیتر خۆت دەزانی مامۆستای فانی یا... | | | |
| ٢٢١ | دغدەر | Dghdar | دوختەر - کچ |
| دغدەر = دوختەر، کچ، دەغدە واش دایکی زەردەشت لەم وشەیە زۆر لە داستانی مەریەم دایکی حەزرەتی عیسی دەچی کە لە پێشان کەرە پەنەکان و کەویکان بوختانیان بۆ فەراهیم و دایکی زەردەشت، داغدەوی یا داخدەوا کردبوو... | | | |
| ٢٢٢ | براتر | Bratar | برادەر |
| براتەر یا برادەریا برازیر ئینگلیزی و برای کوردی وەکوو یەکن بەڵام وەکوو بەش کردنی دوو براکەی داستانی هۆنراوەی مامۆستا قانیعە کە پشیلە خوش خەتوو خاڵەکە (کەت) کتك بۆ کوردە بەڵام قاترە چەموشە لەقە وەشێنەکە هی ئینگلیزە!! یا هی ف، ت و ع د. | | | |
| ٢٢٣ | هواغەر | Huwaghar | خواهەر، خوشك |
| هواغەر، باش، خوش هاوڕێ، خوشك کە حکومەتی کەنیشکاو هویشکا | | | |

<table>
<tr><td colspan="4">پیش لە هیپتا لیان و تا نیزیکەی ساسانیەکان ئەوانیش کوردن هەر دەبێ کوشانیان بەشێك بن لە حکومەتی کەنیشکاوهویشکا کە لە مامۆستا جەماڵ (دوکتور جەمال) دەپرسم بیر و رات چۆنە بۆ ئەم مەبەستە کە لێرەدا عەینا لە هویشکەکانی خوشك هاتوە بەلاّم لە ئاڤێستادا کە کۆنترە ووشەی هواغەر هاتوە.</td></tr>
<tr><td>٢٢٤</td><td>نیاکا</td><td>Niaka</td><td>باوە گەورە</td></tr>
<tr><td colspan="4">نیاکان، باوو باپیرە، ریشەی نژاد، یا نیاکیش هەر وەهایە یانێ بناغەی نیاو ئەژداد، ... باوە گەورە باووکی باووك یا باووکی دایك تا سەر.</td></tr>
<tr><td>٢٢٥</td><td>نییاکی</td><td>Niaki</td><td>دایە گەورە</td></tr>
<tr><td colspan="4">دایە گەورە، دایکی باووك یا دایکی دایك تا سەر، نیاکی دایە گەورە نژادی مرۆڤ لە دایکەوە، یا نیاکانژادی مرۆڤ لە باوکەوەیە، دایە گەورە و باوە گەورە ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە لەرێ دایە گەورەشەوەنژاد گوسەی دەکرێ بەلاّم لە عارەبیدا وانیە کە لە زمانی ئاریایەکاندا بۆ ژن و مندالّی کچ ریّز و ئیحترام دانراوە.</td></tr>
<tr><td>٢٢٦</td><td>تواریو</td><td>Tuoriu</td><td>برازا</td></tr>
<tr><td colspan="4">برازا مندالاّنی برا = دەبێتە برازا.</td></tr>
<tr><td>٢٢٧</td><td>تواریایوترا</td><td></td><td>پوربرازا یانی فەرزەندی</td></tr>
<tr><td colspan="4">برازا ، پور یانێ فەرزند کە تواریویانێ برازا یوترا فەرزەندی برازا</td></tr>
<tr><td>٢٢٨</td><td>تواریا دغدر</td><td>_</td><td>دوختەری برازا، کچی برازا</td></tr>
<tr><td colspan="4">تواریو یا تواریا= برازا، دغدر کچ، دوختەر دەبێتە کچی برازا لە ریزی</td></tr>
</table>

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٢٦ و ٢٢٧ بڕوانە. | | | |
| ٢٢٩ | نەپات | — | نەوەی کوڕ |
| نەپات یانەوە بە نەوەی کوڕ دەوترێ کچ یا کوڕی کوڕ بەرەو خواریش. | | | |
| ٢٣٠ | ناپتی | | نەوەی کچ، نەوە کیژ، نەوەی کناچێ |
| ناپتی نەوەی کچ، کوڕی کچ یا کچی کچ، کوڕ و کناچی یا کناچەی کناچێ. | | | |
| ٢٣١ | براتواریا | | مەمو، مامۆ |
| مەمۆ مامۆ، برای باووك. | | | |
| ٢٣٢ | زاماتر | | زاوا، زاما، زەمای |
| زاما تر هەر زامایا زەمای زاراوەی هەورامیە، شوی کچ، شوی خوشك، شوی پور (میمك) شوی خوشکی دایك و شوی خوشکی باووك و ... هەموو دەبێتە زاوا کە هۆکاری زایینە، دەبێ زایین بەم جۆرە بێ نەك جۆرێکیتر. | | | |
| **ناوی ئەندامانی تەن** | | | |
| ٢٣٣ | کەرەپا | Karapa | کالّبەد |
| کاردپا یا کەرە پالە کار و کردوە و پا تێکەڵ کراوە کە دەبێتە تەن = کالّبەد یانی کالّبەد بزووتنەوەی هەیە، مانای زۆرترە لە تەن. | | | |
| ٢٣٤ | تەنو | Tanu | تەن |
| تەن و جەستەی زیندوە لە هەموو ئەندامەکان و دەمارەکان و دڵ و ژیان | | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| و ڕەوان تێکەڵە، زۆربەی ووشەی تەن و کالّبەد بەسەر تـەن و کالّبـەدی زیندودا دەووترێ. | | | |
| ٢٣٥ | پستە | Pstah | پێست |
| پێست خۆی نیگاداری لە تەن و کالّبەد دەکات وەکوو بەرگ وەهایە بـۆ تەن و کالّبەدی مرۆڤ، پێستی نـازك، پێـستی مرۆڤـ، پێـستی گـا و پێستی بزن و مەڕ و پێـستی مریشك و پێستی گیان لە بەران و پێـستی گیایەکان. | | | |
| ٢٣٦ | مەزگا | Mezga | مەغز، مێشك |
| مەزگا، مێشك فراژترین ساختمانی تەنە، هـەموو هەسـتەکان ، بـیر و زانیاری و گومان لە مێشك دایە، مێـشك ناوەنـدی هەسـتی وەسـتان، برسیەتی، تێری، تینویەتی، تێر بوون لە ئاو، دەرکی بابەتەکان بە هۆی هەستەکانی ڕواڵەتی وەکوو چاو و دیتنی چـاو، گـوێ، بیـستنی گـوێ، دەست لێدان و لە مس کردن چێشتن بە زیان و دەم و زانـینی سـوێری و تورشی و تاڵی و ..بۆ کردن بە لوت و هەموو بۆنەکانی خراپ و خـۆش، هەموو لە مێشکدایە کە دەیزانی و جوێ دەکاتەوە تایبەتی بـە ژیـانِ و زیندەوە هەیە. | | | |
| ٢٣٧ | و هونی | | وون، خوێن، هوون |
| خۆین یا هوونی یا هون بە ئیشمام خۆی یەکێکە لـە هۆیـەکانی ژیـان، ئەگەر مێشك هەبێ و تەن بە هەموو پێویستە کانیـەوە هـەبێ ، بـەلاّم ئەگەر خـوێن نـەبێ و بـە سـیلولەکانی مێـشك و دەمارەکـانی و ... | | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| نەگات، تەن بێ جەرەیانی خوێن مردووە، خوێنی سوور، خوێنی چەور، چەوری خوێن، خوێنی کەم رەنگ و ... خواردنی هەر خوێنێ حەرام و ناپەسەندە. | | | |
| ٢٣٨ | پیداغ | | پی |
| پی چەوری لە تەنی مرۆڤ، لە ناوسکی ئاژاڵ وە ورچ کە لە زستاندا، ورچ دەچێتە خەوی هیپوترمی ئەو کات وردە وردە مەعیدە و دەمارەکانی لە چەوری تەنی کەڵك وەر دەگرن، چەوری بۆ مانەوەی تەن پێویستە، پی داغ = پی بۆ خۆی گەرمایی بۆتەنە. | | | |
| ٢٣٩ | سەرا | | سەر |
| سەرا دوای لابردنی پیتی (١) بۆتە سەر، سەر، هەم بە سەری ئادەمی، مرۆڤ و هەموو گیانلەبەران و گیایەکان و دارەکان دەوەترێ هەم بە سەری کێو و بەرد یانێ بەرزایی دەوترێ جا ئەگەر سەر بەنەمانی ئەو مایە مردن بێ وەکوو سەری مرۆڤ و گیان لەبەران ئەوە یەکێکە لە ئەندامی بناغەی و ئەساسی بۆ ژیان، بەلاّم ئەگەر وانە بێ تەنیا یانێ بەرزایی. | | | |
| ٢٤٠ | ورێسا کەسا | | گیسا، گیس، موی سەر |
| ورێس لە زاراوەی هەورامیدا یانێ گوریس کە لە مووی بزن دروست دەکرا ئێستا لە مەوادی تر یانێ موی سەر و پەلك وەکوو ورێسی (پەلکەکیش، پەو رەش ماری) کە گیس و گیسو شیان پێ وتووە کە | | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەڵێن گیسو دراز (درێژ) گیسو بڕیاگ (زاراوەی ئەردەڵانی بێ گیس، مووی سەر رەش، مووی سەر زەرد، مووی سەری سپی بود، مووی سەری چەرمگە (ئەردەڵانی) مووی سەرەش چەرمی بینە (هەورامی) مووی سەری خەنەیە. | | | |
| ٢٤١ | ریشا | | ریش |
| ریش، موی ریش، ریش درێژ، ریش تاشراو، ریشی خەنە گرتود، ئەوریش بڕاود، ریشی نیە = کۆسەیە، زۆربەی مەغولەکان و نژادی رەسەنی مەغول ریشیان نیە، ماشائەلاّ ریشی مامۆستا چەند درێژە، ریشی بزن، ریشی حەچە، ریشی خرت، ریشیهوشی مینە هاوکاری ژەنراڵ جیاپ (گەورە پیاوی ویتنام). | | | |
| ٢٤٢ | ئینکا | | پێشانی، ناوچا |
| ناوچاو پێشانی، پێشان دەدرێ، دەبین رێ، لەبەرچاوە ناوچاوە یانێ روممەت، یانێ ئەسلەکەی کەرومەتە ها بەڕوودە، هەم پێشانی هەم رووممەت مانای ئاشکرایان هەیە. | | | |
| ٢٤٣ | کشی، چشمەن، ورانزا | | چاو، دیدە، دیە، سۆ. |
| هەر وەها لە ووشەکانی ئەمرۆدا چاو، دیدە، دیە، سۆ هەموو بۆ دیتنی چاوە، بە چاو دیتنە لە ووشەکانی ئاڤێستاش دا سێ ووشەکشی یا کەشی، چەشمەن و ورانزا هاتوە، سەرچاو، سەردیدە، سەردیە، بانی چاو، سۆی چاو، یانێ بینای چاو هاتوە کە تەنیا ووشەی چەشمەن لە چەمی هەورامی دەچێ. | | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٤٤ | بەرۆت | | برۆ |

برۆت = برۆ ئەم ووشەش وەکوو ناخۆین = نینۆك، موی سەر و مووی تەن حافیز و نیگاداری ئەندامی تەنەکە بڕۆ بۆ حافیزی چاوە، و لە کوردەواریدا، نەبوونی برۆ بە عەیب دەژمێردرێ کە زۆربەی پیاوان برۆکانی پڕپشتیان هەیە و برژانگیش خوی زۆر گرنگە، برۆی پڕ پشت، بێ برۆ، برۆی وەکوو مانگ، برۆی کەوانی، کە لە شیعری شاعیرانی کورد و فارس دا زۆر هاتوە تەنانەت بۆ وەسفی پادشا یانیش هاتوە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٤٥ | ناوغا، ناوگا | | لوت، بینی |

ناو غا و ناو گای ئاڤێستایی بۆ لوت هاتوە کە ناو غا دەنگی نەفەس و هەناسەکێشان لە لوتەوەیە، ئەمە نیشان دەدا کە بە زبانی هێندی بە جێگای ناوغاو ناو گا ناك ئەلێن ، دەگونجێ ،چونکە کونای لووت لەولاوە ولە ناقدا (ناوگەلو - ناو قورگ) کە ناق لە زاراوە ئەردەلانیدا بە قورق ووتراوە جۆرە بەلاّم خودی ووشەی ناو گاو ناو غا هەر دوو دەتوانرێ بەیانی چۆنیەتی لوت بێ کە لە ئاوێستاییدا زۆربە بە مانای شتەکان روانیویانە کە جۆر بێ لە گەلّ ووشەکاندا.

| | | |
|---|---|---|
| ٢٤٦ | دەنتن | ددان، دیان |

دەنتن ئاڤێستایی بە مانای ددان و دیان هە، کە بۆ ئەم ووشە ووتراوە دیان شیری، دیانی کرمۆلّ، سی و دوو ددان، بێ دیان، دیان کەوتو کە شاعیرێك هەیە دەلّێ لەزەتی دونیا ژن و ددانە، بێژن و ددان جیهان

| | | |
|---|---|---|
| زیندانه، لێرەدا گۆڕانکاری و بتاش بتاشی زۆر کراوە تا دەنتن بۆتە ددان بەڵام ریشەکەی دیارە وەکوو دیانی زەرافە لە بەهارا. | | |
| ٢٤٧ | ئاوغا - ئاوگا | دەم |
| ئاوغا، ئاوگا ماناکەیان زۆر ئاشکرایە کە دەمی گیان لەبەران ئاویاری کراوە و هەمیشە ئاو لە ناویەتی، جا ئەگەر دەم وشك بێ ئاوی نەبێ نیزیك بە مردنە، یا مردووە بە کەسێکە قسە دەکا و لە قسە کردن ناترسێ ووتراوە فلانی دەمی پاراوە یانێ هەم ئاوی ناو دەم، و هەم قسە کردن نیشانە ژیان و زیندویەتیە، پیاو یا منداڵی لینکیش ووتراوە بەڵام ژنی لینکم نەبیستوە. | | |
| لیکن، ئەوەیە کە ئاوی نێو دەمی دێتە خوارێ و درێژ دەبێتەوە گای لیکنش ووتراوە یا مانگا. | | |

.٢٤٨

هەزوا یانێ زبان یا زوان کە هەر دوو لە کوردی ئەمڕۆدا ووتراوە و لێرەدا لە هەزوای ئاوێستایی تەنیا پیتی (ن) کە نەهاتوە و پیتی (هـ) زیاد کراوە ( لە هەوەڵەوە) دەگونجێ نیشانەی ئەوە بێ کە کاتێ مرۆڤ زبان دەردێنی و دەڵێ ها یا هەلە بەر ئەمە هە یا ها بە زوان زیاد کراوە یانێ دەنگی ها و ناهەنگ لە گەڵ دەرهێنانی زبان‌دا لە ئەم ووشە دا کە زبانە بە وردی تێ دەگەین کە مەبەستی زبانی قسە نیە بەڵکو ئەو برە گۆشتەیە کە لە نێو دەم دا هەیە، ئەمە خۆی نیشانەی کامڵ دەگەیینی، بەڵام ئەمڕۆ ئێمە کە ئەڵێین زمان دەگونجێ هەم ئەو پارە گۆشتەکە بێ

| | | |
|---|---|---|
| و هەم زبانی ئاوێستایی ووتە بێ. یانێ بە زیاد کردنی هە بەزوا). | | |
| ٢٤٩ | گوشا | گوش، گوێ گوێچکە |
| لێرەدا بە هەموو ناوی ئەندامەکان چ برۆ، چ دەم، چ لوت و چ چاو و برۆ و چ ریش و پیشانی (رومەت) چ پێست و چ دان و تەن و کالبەد و چ مێشك و مەغز و چ ئەنگوس ئاماژەی داوە، گوێ خۆی ماهوارە و سەتەلایتی بیستنە بۆ ووشەی گوێ زۆر زێداو درووست کراوە بە ریزی ٢٠٤ بڕوانە. | | |
| ٢٥٠ | کەشا | کەشای ران |
| کە شایانێ ران کەشالەی ران، راستای و نەرمی ران، رانی پیاو، رانی ژن، رانی منداڵ، رانی گا، رانی گوێرەکە، رانی چۆلەکە، رانی مریشك و وشەی ران بۆ گەلەی بزن و مەڕ و گایش دەوترێ کە دەگونجێ بە بۆنەی کو بونەوەی گۆشتی زیاتر لەو ئەندامەدا و ئەستوور بوونی لە دەست و پەل وتراوە ران. | | |
| ٢٥١ | وەرا | بەر |
| وەرا لە گەڵ زاراوەی هەورامی و فەیلی دا جیاواز نیە،کرماشانیش ئەڵێن داداش لەیوەری ئاوەکە پەڕیە ئەو وەری ئاوەگە، لەو کاتەییدا بە گومانی خۆی فارسی قسەی کردوە بەلام ئەوەش: خۆم کرماشانی فارسی نیەزانم وە زوانی کوردی قەزات وە گیانم، ووشەی بەریا دوا بەیانی جیهەتی جوغرافیە. | | |

<table>
<tr><td>٢٥٢</td><td>فستەنا</td><td>پستان، مەمك</td></tr>
<tr><td colspan="3">فستانا، یانێ مەمك دەنگی مەمە یا ماما لە دوو لێوی مندالّی شیرەخۆر دیارە ، مەمك یانێ چکۆلە کە ئێستا لە زاراوەی فارسیدا پستان و پستانك ئەڵێن کە خودی ووشەکانی غەیرە عارەبی لە نێو فارسیدا کوردیە بێجگە لەوەش لە شانامە فیردەوسی و نووسراوەکانی کە سردویدا کە فارسی قالّ و سەرەن مەمك هاتوە. کە دەبێتە کوردی.</td></tr>
<tr><td>٢٥٣</td><td>پرسن</td><td>پالّو، لای، ئیسکی پالّو، پراسو</td></tr>
<tr><td colspan="3">پرسن یا پەرسن ووشەکە لە دواییدا بۆتە پێرشن (لە لاتین دا) یا فارسی یانێ بۆ خۆی تەواو سەربەخۆ نەبوە و بەشێکە لە هۆز یا شتیتر.[٢٢]</td></tr>
<tr><td>٢٥٤</td><td>پرشتی</td><td>پشت</td></tr>
<tr><td colspan="3">پەرشت یا پرشتی ئاڤێستایی بە لابردنی پیتی (ر) بۆتە پشتی — پشت ئەمرۆ هەر چەند لە زاراوەی ئەردەلانیدا دەووترێ.رۆژا پەرشت (گوڵە بەرۆژە) یا پشت لە رۆژ، خۆر ناکا کە ئێوارە و بەیانی روو بە رۆژگار و خۆر، هەتاو، وەر، دەوەستێ و زۆر بەشکۆیە، ئەو جار بە دیتنی ئەمە</td></tr>
</table>

٢٢ . ئەلێن: لە کاتی کۆچی ئارياييەکاندا، چونکە پارسەکان لە لای چادر و رەشمالی میدیاکاندا، رەشمالیان هەلّداوە لە پەنای ئەواندا ماونەتەوە ئەو نێوەیان لێ نراوە، برێک ووتویانە: پەرسە لە پەراسوە یانێ لای بەلّام لە جێگاییک لە ئاڤێستادا دیومە ووتراوە پەرسە یانی دراوسێ.

لە ئاکامدا دەبێ بلّێن: فارس یا پارس یا پرسن پاپیرشین خۆی سەربەخۆ نەبوە و بەشێکی بچوک لە ئارییەکان و ژێر دەستی و فەرمانبەری میدیاکان بوونە و هەموو شتیان لەوان گرتوە و میدیاکانیش کوردن.

| | | |
|---|---|---|
| ئافەرینش ئەزانی چیە و کیە؟ و ئەو ووشانە چۆنە و چلۆن ساز کراون. | | |
| ٢٥٥ | مایەیا | نێوان |
| مایەیا ئاڤێستایی لە کوردی ئەمڕۆشدا میان ووتراوە بە جێگای نێوان کە لێرەدا پیتی (م) و پیتی (ی) و پیتی (١) هەیە دوای جێ بەجێ کردنی پیتەکان و لابردنی (ی و ١)ی و زیاد کردنی پیتی (نون) لە ئاخردا دەبێتە میان هەر جۆر بلێن لە ئەسڵی مەبەستە کە نا گۆڕی کە کورد خۆی زبانێکی سەربەخۆی هەیە و عارەبی نیە و ریشەی زبانەکەشی لە کتێبی دینی پێغەمبەری کوردی خۆی (زەردەشت) هەیە جا بە کوێری حەسودی درۆزن ، هەر بڕۆن وڕ لێ بدەن. ئەوانەی کە ئینکاری کورد دەکەن. | | |
| ٢٥٦ | زک کەشی | ورگ، ورگن، زکن |
| لێرەدا زک کەشی سانسکریت کە لە قۆناخی دوەمدا هەبوە (قۆناخی هەودڵ ئاڤێستا بەکوردی ئەمڕۆ نیزیکترە، بۆ ئەم ووشە ئەمڕۆ زور هاودڵ ناو زیدا و زیدەی بۆ ساز کراوە. زک زل، زک زا، سك زا، لە باتی ورگن وتراوە گەیین کە پیتی (ی) ناخوێنرێتەوە. | | |
| ٢٥٧ | ناف، ناف ئاوێستایی = ناووك | ناووك |
| ناووك برێن - برینی ناووك، ناووکە بڕان، ناووکی قەیسی ( شێلانە) قەیسی خوی ووشکە، شێلانە تەڕە تۆم و ناووك یەکن، برێك دەڵێن تۆم و دیکە دەڵێن ناووك بەڵام ووشەی ناووك لێرەدا بەو نیشانە دەڵێن کە لە | | |

| | | |
|---|---|---|
| بان زکەوە وەکوو کونـا هەیـە وە زۆر جـاریش لـە کوردەواریـدا دەڵـێن ناووکی کەوتوە بە نیشانەی ئەوەی کـە ژان نـەکات و دەمـی ووشـکەو دەچێتە لای حەکیم باشی گەرەك و ، ناووکی دەگرێتەوە، ناووکی گردەوە (بۆ کەسێ دەووترێ کە کەسیتر دەخەڵەتێنێ). | | |
| ٢٥٨ | شیرنی | سەرین |
| سەرین لە کوردی ئەمڕۆدا، شیرنی لـە ئاڤێستادا تـەنیا لـە بەرهـەمی مانادا یەکن کە سەرین خووی شیرینی و خۆشی دەهـێنی و یـەکێ لـە ئامێری ئاسایشی خەو، سەرینە. هەر چەند پیتی (ش) و (س) پێکـەوە لە کرکە دا نیزیکن، شیرنی لە گـەڵ ووشـەی شـیرینیدا هـاو نـاو هـاو وەزنن، هەرچەند لە ئەردەلانیدا سەرنیا ووتراوە کە بە شیرنی و سـیرنی نیزیکە. | | |
| ٢٥٩ | هەختی | ران |
| هەختی ئاڤێستایی دەبێتە رانی کوردی ئەمڕۆ بە ریزی ٢٥٠ بڕوانە. هەو هومانای باش دەداکەران خوی باشە. | | |
| ٢٦٠ | یاونە ئەپستا ئاوێستایی | ئەندامی نهێنی |
| ٢٦١ | تونی - سەنسکریتی | |
| یاونە یا تونی یـا یاونـەی ئەپـستا کـە سانـسکریتی و ئاڤێـستایە بـە ئەندامی نهێنی ووتراوە، شـەرمی کردوە کە بە رواڵەت بلێ وەکو کوردی باشور بێ پەردە ئەڵێن ئەوەش بە هۆی نیزیکی لە عارەبـەوە هەیـە کـە | | |

| | | |
|---|---|---|
| ئەڵێن ئەدەب لە لای عەرەب شتێکی عەجەب، کەردم لە لای عەجەم شتێکی عەدەم (داستانی داوودی تایی لە بەرچاو دەگرێ). | | |
| ٢٦٢ | بازو - ئاوێستایی | |
| ٦٣ | یاهو - سەنسکریتی | |
| بازوی ئاڤێستایی و یاهوی سانسکریتی بازوی کوردی ئەمڕۆیە کە لە کوردیدا باهو بە بازوو وتراوە کە دەڵێن شان و باهو - باهوش بە دارێکە تاشراو و رێك و پێك کراوە دەڵێن. | | |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٦٤ | زاستا | دەست |
| بە ریز ٩٨ بڕوانە ئەردەستو وتویەتی: دەست لە کاتی قسە کردندا مێشکی دوهەمە هەڵبەت دەست کە ئازاد بووە مێشکیش ئامادەی وتە بوە، کە پێش لەوە مرۆڤ لە سەر دوو دەست و دو پا رێگای بڕیوە تا سەردەمی پریمات (مەیمون نما) زۆر لە زانایان ئەڵێن: ئەگەر ئێمە شامپانزە و یا گوریل و یا ئوران گوتان بۆ بێتین لە ئێستا کە ئەم جوردین کە ئەو هەموو جینایەتە دەکرێ باشتر لەودیە تا ئادەمی بەهەشتی بوبێت لە بەهەشت دەرکراو بێ. | | |
| ٢٦٥ | ئەنگوشتا | ئەنگوشت، ئەنگوس |
| بە ریزی ٩٨ بڕوانە. | | |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٦٦ | مشتی، مشتا | مشت، مست |
| بە ریزی ٢٠٥ بڕوانە. | | |

تا ئێرە ٢٦٦ ووشەی ئاوێستایی ووتراوە هەرچەند برێکیان دووپاتە کراوەتەوە بەلاّم کەمتر ووشەیەك ئاڤێستایی هەبوە لە مانایا لە شێوەی پیتەکاندا لە گەڵ کوردی ئەمڕۆدا یەك نەبن، هەرچەند لە پێش ئایینی ئیسلامدا پیتەکانی ئاوێستا بەم شێوە نەبوونە. ووشەکانی ئاڤێستایی کە لە ئاسەوارە کۆنەکاندا وە دەست کەوتوە یا بە خەتی ئاڤێستایی میدیایی یا ماسی سوراتی کوردی یا بە خەتی یونانی یا خەتی بزماری سومیری و میدیایی یا ئورارتویی و عیلامی نووسراوەتەوە کە نونەکانی دەگەرێتەوە بۆ هەزارەی دوم و سێوم پێش لە زایینی.

ئەمرۆ شێودی خەتی عارەبی بوتە خەتی فارسی و کوردی و تورکی بەلاّم ئێستا تورکی تورکیا بە پیتی لاتین ووشەکانی تورکی دەنووسیّ لە تورکیادا و لە سوریاشدا کوردەکان کوردیان بە پیتی لاتین نووسیوە و ئێستاش لە برێك جیّ دا وردە وردە خەریکن کە کوردی بە پیتی لاتین بنووسن هەرچەند ئەم ردوەشتە دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە عارەب و ژێر چەپۆکەی پیتەکانی عارەبدا نەجاتمان هەبیّ بەلاّم زەرەری زۆریشی هەیە وەکوو ئەوەی کە شا ئیسماعیل سامانی کە خۆی کوردە، بۆ نەجات لە زبانی عارەب و نووسینی نووسەرانی کورد و فارس بە عارەبی زبانی دەری و نیشکاشی کرد، فورمی و رەسمی وە نووسەران توانیان لە دوایدا بە زبانی دەری بنووسن بەلاّم لەم لاوە زەرەرێکی زۆر وەکوردان کەوت کە

نــیتر کوردەکــانی لار و مازەنــدەران و گــیلان و سیــستان و بلوچــستان و ئەفغانستان و ئازەربایجان و ئەران و نەخجــەوان زبــانی کوردیــان لــە بــیر بردەوە و بە زبانی دەری کــە ووشــەی کــەمی کــوردی تێدایــە و ئێــستا ئەفغانیەکان و تاجیکەکان بەو زبانە قسە دەکەن و فێر بوونــە هەرچــەند، ئێستاش پیرە پیاوان و پیرە ژنان هێشتا زبــانی خۆیــان لــە بــیر نەچــوە و فرامۆشیان نەکردوە. کە لەلار و مازەندەران و سیــستان و بەلوچــستان وە ئەوانەی وەکوو کورد[٢٣] گەلی کە حکومەتیان هەبوە پــیرە پیــاوان و پــیرە ژنان هێشتا بە کوردی قسە دەکەن.

کە شاعیری گەورە ئەفغانی بە ناوی ئەبوالحەســەن عــەلی لوکــەری لــە مەدحی ئەمیر رەزی ئەبوالقاسم نوح، کوری مەنسور پادشای سامانی کــە لە ساڵەکانی ٣۶٥و ٣٨٠ کۆچیدا پاشایی کردوە و لە نژاد پــاکی کوردانــە ئەڵێ نگار من آن کرد گوهر پسر، کە زین است و حسن از قدم تا بە سر خۆشەویستی من ئەو کورە کوردەی کە گەوهەرە جوانی و قەشــەنگییە لــە پێیان تا تەوقی سەری.

هەموو گفت درنی ای لوکری غم خدمت شاە خــوری، مخــور هــەر ئــەو ووتی بە من لە لوکەر دانیشە مەیە دەرەوە خەمی شا مەخۆ بە تەفسیرا، یانێ شاعیری کوردی ئەفغانی وتی: خۆشەویستی من ئەو کورە کوردە (بە نوح پادشای ســامانی دەڵــێ) کــە لــە پــێ تــا تــەوقی ســەری جــوانی و قەشەنگیە، هەر ئەو وتی بە من ئەی لوکەری (ناوی لادیەکە لوکەر بوە و

---

٢٣. لە غوریــستانی حکومەتی کورد گەلی.

وا له ئه‌فغانستدا و کوردنشینه) له دێ دانیشه و مه‌یه ده‌ره‌وه، که ئه‌گه‌ر خه‌می شاو و خه‌می خزمه‌تی شات هه‌یه، خه‌م مه‌خۆ یا هه‌ر ئه‌م شاعیره کورده له ئه‌فغانستاندا له و سه‌رده‌مه‌دا که هاورێی عبدالله وه‌زیری سامانی بوه له مه‌دحی ئه‌ویشدا ده‌ڵێ، عبدالله ابن احمد وزیر شاه سامانی به سورت آدمی آمد به معنی نور سبحانی، خدایا چشم بد خواهم کز آن بگردانی همی تا بد شعاع داد از آن پر نور پیشانی.
عه‌بدالله کوری ئه‌حمه‌د وه‌زیری شای سامانی، پەرتوی نوری دادی له پێشانی ئه‌م عه‌بدوڵلاّ به شێواز ئاده‌می و به مانا نوری سوبحانیه خدایا له چاوی خراپ بیپارێزی.

| ریز | ئاڤێستایی | کوردی |
|---|---|---|
| ٢٦٧ | ده‌شینا | لای راست، باشور |

ده‌شینا ئاڤێستایی به مانای لای راست و باشوره که لایه‌نی جوغرافیایی نیشان ده‌دا که ئێستا چوار لایه‌ن ده‌بێته باکور و باشور و رۆژ هه‌ڵات و رۆژ ئاوا که ئاڤێستایه‌که‌ی ده‌بێته ئه‌پاختر (باکور)، ده‌شن (باشور)، خور ئاوه و خور به‌ر یا هادبا (باکور) یانێ لای راست باشوره‌وه لای چه‌پ باکوره که مرۆڤ روو به خۆر وه‌ستاوه که لای راستی ده‌بێته باشوور و لای چه‌پی ده‌بێته باکورو ڕوبه‌ڕو خۆر هه‌ڵات و پشتی خۆرئاوا.

| | | |
|---|---|---|
| ٢٦٨ | هادبا | لای چەپ، باکور |
| لە نیم دایرەی باکوری گوی زەوی هەموو ئاوەکان بە لای راستدا دەڕۆن لە ژێر خەتی ئاوە راست (خەتی ئوستوا) هەموو ئاوەکان راست دێنە خوارێ لە نیود بازنەی باشووری گوی زەوی بە پێچەوانە. | | |
| ٢٦٩ | ژن — جن | ژن، ژەنی |
| بە ریزی ١٦٤ بڕوانە ژن ئاڤێستایی لە گەڵ ووشەی ژن یا ژنی لە کوردی ئەمڕۆدا یەکن کە هەڵبەت وا دەگەیێنێ کە ووشەی جن لە عارەبیدا لە ئاڤێستا گێراوە کە ژن و ژیان و ژینگە لە ئەم بنەماڵەن. | | |
| ٢٧٠ | زەنکا | ئێسکی پێ |
| زەنکا، ئاڤێستایی یانێ ئیسکی پێ دەگونجێ بە مانای زانوشی بێ کە نیزیکترە بە کوردی ئەمرۆ، بۆ ئەم ووشە چەندین ووشەی لێ داتاشراوە، وەکوو ئێسکی ران، ئێسکی ئەنگوس، ئێسکی پرتوکاو، ئێسکی تازە، ئێسکا سوکا، ئێسکی قورسە کە لە ئەردەلانیدا پێ ئەلێن پێشە و لە برێك جێگادا ئێسقان. | | |
| ٢٧١ | پدا، پزا ، پەداوپەزا | پا، پێ |
| ئەم ووشەی ئاڤێستایی بە لابردنی پیتی (د) و یا (ز) دەبێتە پا و گۆرانی پیتی (ا) بە (ی) و لابردنی دال یا زا، دەبێتە پێ مرۆڤ بە پێ دەروا بە رێگادا ئەو مندالە پاپاپێ گرتوە، پای شەل، پێشەل و ... کە لە سەرەتاوە بە دەست و پێ دەڕوا کاتێ کە پیریش دەبێ هەر وەهایە. | | |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٧٢ | پشتا | پاژنە |
| پشتا ئاڤێستایی جیهەت نیشان دەدا کە پاژنەش لە پشتە. | | |
| ٢٧٣ | زێردیا | دڵ |
| زێر دیا بە مانای دڵ کە لێرەدا تەنیا پیتی (د) لە دڵ هاتوە و بە گۆڕانکاری و لابردنی زۆر پیت دەبێتە دڵ بەلاّم دەبێ بلّێین: دیا بە مانای سینە زێر یانێ ژێر لە ژێر سینە کە دەبێتە دڵ (دیا = ئاشکرا و لەبەرچاوەکە سینە بە نیسبەتی دڵ لە بەر چاوە بەلاّم دڵ نابین رێ دیا، دیار، دیاکۆ. | | |
| ٢٧٤ | سوشی | سی |
| سی کە ژمارەی ثریسات ئاڤێستایی و تریسات سانسکریت یانێ سی بە ریزی ٢٤ بڕوانە. | | |
| ٢٧٥ | گریوا | گەردەن، گەڵو، قوڕگ |
| گریوا ئاڤێستایی چونکە قورگ یا گەڵوی مرۆڤ گری تیدایە ئەودتا لە ئاڤێستایی‌دا گریوا هاتوە روو بە ماناکەی مەبەستە، قو.ڕگ درێژ و (کەسێ کە زۆر قسە دەکا) قوڕگ گیراو، گەردەن پان = توانجە لە مرۆڤی لاژو. | | |
| ٢٧٦ | زانو | زانو |
| زانو = ئەژنو نێوانی ران و قاچ کە ئەرکی زور گرنگی هەیە لە رویشتنی‌دا، حالّەتی ئینعتافی هەیە، و ئیسکێ کە ساف و گرد لە وێدایە پێی ئەڵێن کە شکەك یانێ کەشکی چکۆلانە کە بە قاچ پوزیش | | |

| | |
|---|---|
| ئەڵێن، لە لولە کێشی دازانو زۆر گرنگی هەیە | |
| تورا ئاڤێستایی یانێ مەعدە، بەشێکە لە زك کە بە ناوی دەستگای هەزمیش ناو ئەبرێ. | ٢٧٧ |

| نێوی گیانلەبەران | | |
|---|---|---|
| کوردی | ئاڤێستایی | ریز |
| لە نێو کوردەواری‌دا ئەو کەسەی کە بۆ چاوەدێری دەخل و دان پارەی پێ ئەدەن و چاوە دێری‌یان بۆ ئەکات. | سەپان | ٢٧٨ |
| دێڵە سەگ | سپاکۆ | ٢٧٩ |
| سەگ،گیان لەبەرێکی ئەهلی و باوەفایە، خوراکی گۆشت و ئیسقان و نانە بەژنەکەی میترادات (خواداد) شوانی ئاستیاگ دوایترین پاوشای میدیا سپاکۆ ووتراوە کە ئەم ژنە لە بەر ئەوەی هەر ساڵە چەند منداڵی دەبوو پێیان دەوت سپاکۆ وە ئەم ژنەی میترادات بوو کورشی کوڕی ماندانای کچی ئاستیاکی پەروەردە کردبوو، هەر وەها ووتم سەگ خوراکی گۆشت و نان و ریزەنانە (وردەنانە). | | |
| گورگ، وەرگ، وەرگی | وەهەرکا | ٢٨٠ |
| وە هەر کا زۆر نیزیکە بە زاراوەی هەورامی کە دەڵێن وەرگ، وەرگی | | |

| | | |
|---|---|---|
| گورگ یا ورگی گیان لەبەرێکە دەرەندە و کێوی کە هێرش دەباتە سەر ئاژاڵی خەڵکی و خوراکی گۆشتە. | | |
| ٢٨١ | ئەرکشا | وورچ، خرس |
| ئەرکشا یا ئەرکەشا بە مانای ورچ هاتوە کە گیان لەبەرێکی ترسناکە دەتوانێ لە سەر دوو قاچی راویستێو و بڕواتە ڕێگادا، نێرەکانیان بیستراوە لە خەڵکی مەریوان کە نێرە ورچەکان کچی لادیکیان دزیوە و لای خۆیان لە ئەشکەوتدا رایان گرتوە ورچ خوراکی گۆشت و گوێز و میوەجاتە. | | |
| ٢٨٢ | شگالا | شوغاڵ، چەقەڵ |
| شوغال یا چەقەڵ وەکوو ریوی وەهایە گیان لەبەرێکە لە رەستەی سەگان و شەوانە لە دەوروبەری ئاوایەکاندا لورە و واقەیان دێت، لە دەشتی شارەزووردا چەقەڵ زۆرە، بە تایبەت لە دەوروبەری دێ کۆن و خیلی حەمە و گردی سەفا و خورماڵ. | | |
| ٢٨٣ | موشیا | مشك، موش |
| موشیا ئاوێستایی مشك کوردی گشتی و موش بە ئیشمام زاراوە کوردی فەیلی و کەلهوڕی و لوڕیە. گیان لەبەرێکە کە لە ژێر زەوی و نێوی دیوارێ کە چیمەن تونەبی کونای دەکات و بۆ زەخیرە و خواردەمەنی دەگەڕێ، گیان لەبەرێکە زك و زای زۆر ئەکات بە تایبەت لە لادیەکاندا، زۆر زەرەر دەگەێنێ بە خواردەمەنی و گەنم و خەڵات بڕێکیان لە حەسیل دان و بە زاراوەی هەورامی مڵەی پێ دەڵێن مشك جۆرەکانی زۆرە دوو | | |

| | | |
|---|---|---|
| پایلکە جورێکترە لە مشك. | | |
| ٢٨٤ | سستَن | کەرۆیشك، هەورێشە و کەورێشك |
| کەروێشك گیان لەبەرێکی بیّ ئازارە هەم وەحشی و هوڤی هەیە و هەم ئەهلی زك و زای زۆر دەکات هەر کات دەزایی ٣ و ٤ و ٥ و تەنانەت خۆم تانۆشم[٢٤] دیوە ئامیلکەیێکم بە شێوەی توێژی یەك ساڵە لەم بابەتەوە بە زمانی فارسی نووسیوە، خوراکی کەرویشك باشترین گیایەکان و هەویج (گێزەر) و میوەجاتە. | | |
| ٢٨٥ | ئەشوا سانسکریتیە | ئەسپ |
| بە ریزەکانی ١٩٤ و ١٩٥ و ١٩٦بڕوانە ئەسپ یەکیّ لە گرینگترین ئامێری سواریە بۆ خەڵك بە لای مەغولەکانەوە ئەسپ و مایین زۆر پڕ بایەخ بوونە و تەنانەت لەشیرمایین زۆر کەڵکیان وەرگرتوە، خۆراکی‌یان گیایەکان و کاو جۆیە. | | |
| ٢٨٦ | گاو | گا، گاو، گاوی |
| گایا گاو بەلای ئاریایەکانە وە زۆر پڕ بایەخ بوە و ڕێزیکی تایبەتی هەبوە، چونکە مرۆڤی ئاریایی بە تایبەت کوردان هەم لە شیر و گۆشت ئەو گیان لەبەرە کەڵکیان وەرگرتوە و باریشی بۆیان هەڵگرتوە و هەم سواریشی بوونە، هیندیەکان ڕێزێکی زۆر بۆ گاو و مانگا دادەنێن تا ئەو جێگایەی پێان وتون گاپەرست، خواردنی گا گیایەکانەو کاو و جۆ.... | | |

---

٢٤ . نیشمام کاربەری ووشە لە نێوان زێر و بوردا.

<table>
<tr><td colspan="3">(ئاڵف).</td></tr>
<tr><td>٢٨٧</td><td>بزا، ئەزا</td><td>بزن، بزا</td></tr>
<tr><td colspan="3">بزایا بز یا بزن بە زاراوەکانی کوردی گیان لەبەرێکە شاخدار کە بزن کۆڵیش هەیە بیچوەکەی پێ دەڵێن کار و بۆخەڵکان زۆر کەڵکی هەیە لەموەکەی بۆ پلاس و رەشماڵ و گورێس و لە خۆشی و لە شیرەکەی و گۆشتی کەڵك وەردەگرن، خۆراکی ئەم گیان لەبەرە جۆ و ئاڵف و جورەکانی پێستی سەوزەکان و سەوزەیە و گیایەکانە.</td></tr>
<tr><td>٢٨٨</td><td>نوشتر</td><td>ووشترە، حوشتر، ووشتر بە لای عارەبەوە زۆر گرینگە</td></tr>
<tr><td colspan="3">ماوەیکی زۆر بە رێگادا بڕوات تەوانایی هەیە ئاو نەخواو و ئەمەش بۆ دەشتی بێ ئاو و هەڵگرتنی مرۆڤی عارەب زۆر بە سود بوە، عارەب بۆ ناوی ووشتر دەیان ناوی هەیە، ووشتر دەتوانێ لە کۆهانی خۆیدا ئاو زەخیرە کات ووشتر زۆر بەتاقەت و حەوسەڵەیە. زۆربەی خواردنی دڕیکی بیاوانە</td></tr>
<tr><td>٢٨٩</td><td>هوخرا – هوکرا</td><td>خوگ، بەراز</td></tr>
<tr><td colspan="3">بەراز یا خوك دوای تاشینی زۆر و جیبەجێ کردنی پیتەکانی هوخرا و هوکرا و هێنانی پیت ووشەی خوك دروست کراوە، خوك یا بەراز گیان لەبەرێکی چوار پێ وەکوو گا وەهایە بەلاّم بچوکترە نێرەکانیان شفرە یانێ دیانێ درێژی هەیە و مێیەکانیان شفردیان نیە بە بیستانی شوتی و جۆرەکانیتر بەرهەمی لادیەکان زۆر زەرەر وارد دەکەن بەلای برێك لە ئال</td></tr>
</table>

<table>
<tr><td colspan="3">حەقەکانەوە بەراز موقەدەسە و هەرچەند پێیان دەڵێن گۆرانی خوگ خۆر کە موسڵمانەکان لەم بابەتەوە بویان ساز کردوون، دەڵێن لە کاتی تەلقین خوێندندا دەڵێن شپلی شەپان شپ لیت نەیا کاکۆڵ داووسەر لیت نەیا عەلیە روتەڵە پاشقولت نەیا کە بە بەراز، ئەڵێن گاکول داوو. بەلای موسڵمانانەوە گۆشتی خوگ حەرامە بەلام لە رۆسیە و ئوروپادا حەرام نیە، وە لە ئێرانی باستانیدا لە ئاسەوارەکان وەدەر دەکەوێ کە نێچیری بەرازیان زۆر کردوە و باشترین گۆشتی هەبوە.</td></tr>
<tr><td>٢٩٠</td><td>خەرا، کەرا</td><td>کەر، خەر</td></tr>
<tr><td colspan="3">بە ئەندازەی کە کەر بە مرۆڤی هەوەڵیە و خەڵکی لادێ خزمەتی کردووە، وێنەی نیە ووشەی کەر لە بەر ئەوەی کە زۆر کار دەکا و کاری کردووە بە ناوی کەر ناو بەراوە، لە ناو خواردنەوە دا هیچ گیان لەبەرێك وەکوو کەر بەشکوتە میز ئاو ناخواتەوە، خواردنی گیایەکان و هەموو درك و داڵ و جۆویە و کایە کە سەعدی ئەڵێ گاو کەرانی باربەردار باشترن لە ئادەمەکانی مەردم ئازار، کەری هەژار باری دەکەن و سواری بان بارەکەشی دەبن و هیچیێ ناڵێ بەلام هومێدم وایە رۆژێك، کەر لە خاوەن ستەمکارەکەی بێتە قسە و پێ بڵێ ئەو ستەمە تاکەی؟</td></tr>
<tr><td>٢٩١</td><td>وەرازا[٢٥]</td><td>گوراز، بەراز</td></tr>
</table>

٢٥ . برێک لە هۆزەکانی کوردەواری بە ناوی هۆزی بەراز بەناوبانگن لادیەک لە لای سنەدا هەیە بە ناوی ئاوایی بەرازان ئەمە ئەوە دەگەیێنێ پێش لە هاتنی ئیسلام بەراز جێگای ریز بوە.

بە ریزی ٢٨٩ بڕوانە لە ئوروپا و روسیە و ئوکراین وولاتی غەیرە موسڵمان بەراز پەروەردە دەکرێ بەراز یا گوراز = خوك یان هەیە و زۆر کەڵکی لێ وەردەگرن بەڵام لە قورئاندا گۆشتی بەراز حەرام کراوە، بەداخەوە لە ولاتی ئێمەدا لە بیرمەکە خەڵکی تەواو لادێك (دەڕژانە ملی بەرازێکدا و بێ بەزییانە دایان دەپلۆسی و ئێستا گورازێك لە ولاتدا نابینرێ.

| | | |
|---|---|---|
| ٢٩٢ | سەئینە | سیمورغ |

سەئینە مونەنسی سەئینی‌یە چونکە سەئەنی دوخت یاسین دوخت دایکی رودابە کە رودابە ژنی زاڵ و دایکی رۆستەمە، سیمورغ باڵندەی ئەفسانەییە کە لە نێو کوردستاندا زۆر داستانی بۆ ساز کراوە، تەنانەت دەڵێن سیمورغ زاڵی پەروەردە کردوە لە دەیان داستاندا کە خۆم بیستوومە سیورغ بۆ نەجاتی مرۆ گەورەترین خزمەتی کردوە تەنانەت پاڵەوانی وون بویی لە ژێر زەویندا نەجات داوە و هێناویەتە سەر زەوین و لە جێگای خۆی دایناوە بەڵام پێ ویستی بە خۆراکی گۆشت هەبوە تا تەوانایی هەبێ وەکوو فرۆکە، مرۆڤەکان و بارەکەی هەڵگرتوە، سیمورغ فرۆکەی گیان لەبەری ئەفسانەیی ئاریایەکان بە تایبەت کوردان بوە، سیمورغ لە تەنگانەدا نەجات دەری مرۆڤ بوە لە کتێبی مەسنەوی مەولەویدا داستانی سیمورغ هەیە. دەگونجێ ناوی شاری سنەش جگە لە سینە و ساناندژ سەئینە (ئاریایی یا ئاڤێستایی) بێ کە وێنەی ردشە هەڵۆکە سیمورغ بێ.

| | | |
|---|---|---|
| ٢٩٣ | سیمورغ | سەئینە |
| ئەلێ: دوای ئەوەی باڵندەکان کۆ بونەو بڕیاریاندا بچن بۆ لای سیمورغ و پەی بە ڕاستی بەردن بەڵام دوای خەباتێکی زۆر، بۆ چاو پێ کەوتنی سیمورغ دیتیان خۆیان سی‌مورغ = سی باڵندەن ئەمە یانێ چی؟ یانێ خۆ ناسین پێش لەوەی خودا و خەڵك بناسی دەبێ خۆت بناسی. | | |
| ٢٩٤ | ئەکشی | گای نێر |
| | | |
| ٢٩٥ | باتو | جادو |
| بە ریزی ١٠٢ بڕوانە. | | |
| ٢٩٦ | وات | با - وا |
| وات یاوا لە زاراوەی هەورامی و فەیلی و کەلوڕیدا واهاتوە لە ناوچەی کولیایی بەشی سونقور زۆربە بە با ئەڵێن وا وای زەلانەن یا زریان کە بای باکورە وە وای شەماڵ کە بای باشورە وە زۆربە خاك و خۆڵی دەشتی عارەبەکان دێنێ بەڵام لە کاتی بەهاردا هەر ساڵ بەفر زۆر بێ‌خەڵك زۆر حەزیان لە بای باشورە چونکە گەرمە و بەفر دەکاتە ئاو ووتەیەك، ئەڵێن شەماڵ ئامانن کارمان تەنگەن لە سەرما و بەفردا کارمان لەنگەن . | | |
| ٢٩٧ | ئاتر | ئاگر |
| ئاتر یائاگریا ئاوور یا ئاوری‌یەکێ لە مەتەکانی جەوهەری مرۆڤە کە فەلاسیفەی یونان دەیان وت مرۆڤ لە ئاو و ئاگر و خاك و هەوا دروست | | |

بوە، لە دواییدا پزیشکەکانی سەدەی ناوەراستیش خودی مرۆڤیان بەم جۆرە هەڵدەسەنگان کە ئایا ئەو مرۆڤە خۆی ئاگرینی هەیە یا... کە خودی ئاگر و کەشفی ئاگر نیسبەت دراوە بەلای کوردەکان (ئێرانیەکان) کە زەردەشت ئاوری موقەدەسی هێناوە و بۆتە هۆی ئەو هەموو پێشکەوتنانە و بێداشتی گشتی کە ئاگر میکروبی هەموو ئەو شتانەی کە دەبێ بە ئاگر بکولێ یا ببرژێ لای دەبا — کورد بەم جۆرە خزمەتی گەورەی بە کۆمەڵگای مرۆڤ کردوە. بەلام عارەب لە بیابانی سوزانی ئاگریندا نیازی بە ئاگر نەبوە وە هەرکات خۆر هەلاتوە لەعنەتیان لێ کردوە، چونکە گەرم بوە بەلام لە کوردستانی سارد و سەهۆلْ بەنداندا بەرێزەوە بەخۆر نیگایان کردوە و سروودی شادیان خوێندوە (لە کاتی خۆر هەلاتندا).

| ٢٩٨ | ستارە، ئەستار | ئەستێرە |
|---|---|---|

ستارە یا ئەستار یا ئەستێرە خوی یا رووناکی هەیە وەکوو خور و زۆر لە ئەستێرەکان یا رووناکی نیە وەکوو ئەستێرەی زەوی و مانگ و ... کە رووناکیان لە خورە کە لە کاکێشانی رێگای شیرێدا ووستاوە، و زیاتر لە ١٠٠ میلیارد کاکیشان هەیە کە هەر کام زیاتر لە یەك سەد میلیارد ئەستێرەیان وەکوو زەوین و خۆر و گەلاوێژ و هەیە، زەوین بەلای ئەم هەموو ئەستێرەوە وەکوو یەك میلیونیم پەڕەکایەکیش نیە. فەزای بێپەر نیزیکەی ٧ تا ٨ میلیارد ساڵ نووری‌یەو نیزیکە ١٤/٥ میلیارد ساڵ لەوەو پێش هیچێ بوونی نەبوە لە ئاسەواری تەقینەوەی ئەتومێکدا ئەم

| | | |
|---|---|---|
| هەموو کاکێشان و ئەستێرەکانی بێ نوور با نوور پەیدا بوونە زەوین و خۆر نیزیکە ۴/۵ تا ۵ میلیارد ساڵ لەمەو پێش پێك هاتوە ۴ یا ۳/۵ میلیارد ساڵ گۆزراوە تا بوونەوەری تاك سیلولی پێك هاتوە. | | |
| ٢٩٩ | هوون | خون یا خوێن هوین |
| بە ریزی ٢٣٧ بڕوانە. | | |
| ٣٠٠ | نمنت،نیمو | نوێژ |
| نمەت یانێ منەت کە عارەبیە کە لە مە گیراوە منت خودای عەزەوەجەللە لە هەوەڵی گوڵستانەوە یانێ کڕنۆش بردن و خوێندنی برێك ویرد و دوعا لە ڕۆژ هەڵاتی ئاسیادا دەبینین کە بودایەکان کاتێکە کرنۆش دەبەن بە دەما و لە سەرزەوین رادەکشن لە ئایینی ئیسلامدا چەمانەوە بە سەر ئەژنۆدا (رکوع) و دانیشتن و سەر بە زەوین نان خۆی دەبێتە (سەجدە کردنە هەر دوو ئەرکانی نوێژن سەرخەواندن نەتەواو بۆ گەورەکان و ئیزەدەکان و دێوەکان هەر وەهایە. | | |
| ٣٠١ | دایووە | دێو، ئیزەد |
| بە ریزی ١٦٥ و ٢١١ بڕوانە. | | |
| ٣٠٢ | یاز، یەسنا | نیایش و پەرستش |
| بە ریزی ١٠٠ بڕوانە ١١٦ و ١٠٨. | | |
| ٣٠٣ | بەگا، بەغ | بەگ، خواوەند |
| ووشەی بەغداد یانێ خوداداد ووشەی ئاوێستاییە، بەگیش یانێ خوا وا | | |

| | | |
|---|---|---|
| دەر ئەکەوێ پاوشاکان و بەگەکان خۆیان بە خوازانیوە وەکوو فیرعەونەکان بەلاّم لە نێوان کورداندا جگە لەوە هەڵگری ناوەکە بوونە و جگە لەوەی لە روداوی نەمرود دا هەبوە خۆیان بە خوا نەزانیوە بڕوانە ویشتاسب شا و حکومەتەکەی، (پاساوە بۆ ئەم ووتەم). | | |
| ٣٠٤ | فرەودشی | راسەڵی گیان لەبەران، راسەڵی رەوان |
| فرە ودشی لە دوو وشەی فرە، وە ودشی تێکەڵ کراوە، فرە یانی زور وەش یانی خۆش خۆشی زۆر بە لای ئاڤێستایەکانەوە دەبێتە راستی و راستی رەوان خۆشی دەبێتە ئارامی بۆ رەوان، زۆر لە ناوی بنەماڵەی زەردشتیەکانی یەزد فەرەوەشیە کە خۆم جارێکیان نامەوەرەخنەیکم لە فەردوەشی سەبارەت بە باسی دەروێشەکان لە تەلەویزیونی ئێراندا نووسیوە و هێشتا هەر رەش نووسەکەی ماوە. | | |
| ٣٠٥ | ئەفری | ئەفرین دوعا |
| بەریزی ١٠٠ و ١٨٦١٩٠ و ١٣٣ بڕوانە. | | |
| ٣٠٦ | ئەستو، ئەستاوتر،ئێستاومە | ستایش، ستایش کەر |
| بە ١٠٠، ١١٦، ١٠٨ بڕوانە ستایش کردن نیایش کردن هەم بۆ ئافەریننده و هەم بۆ گەورەکان یا ئەوانەی جێگا ریز بوونە باو بود | | |
| ٣٠٧ | فەرشتی | پرستش |
| بە ٣٠٦ و ١٠٠ و ١١٥ و ١٠٨ بڕوانە. | | |
| ٣٠٨ | گا، گاتا | ئاواز،گۆرانی |

| | | |
|---|---|---|
| گاتەکان کە خۆی بەشێکە لە ئاڤێستا بەشێکە لە سرودەکان و ئاوازەکانی زەردەشتی پەیامبەر لەو ئاوازانەدا ستایش و نیایشی هەیە، هەرچەند خودای یەسنای یایە زناخۆی نیایشە بەلاّم ووشەی گاتا یانێ ئاواز و گورانی. | | |
| ٣٠٩ | ئاس مەن | ئاسمان |
| ئاسمەن یا ئاسمان ئەوەیە کە لە زەوین بەرزە لە هەر لایەکی زەوین ئاسمانەو ئەستێرە، زەوین لە جازبە و هێزی راکێشەری خۆر وەستاوە، ئەگەر بێت و رۆژێك لە هێز و نیروی راکێشەری خۆر دەرچێ بە تەواوی کاول دەبێ . | | |
| ٣١٠ | میی‌نکا | کێو |
| میی‌نکا، نیگای من جێگای روانین، کێو کە بەرزە جێگای روانینە خەڵکان ئێستاش بە شێوازی سورشتی بە کێو، کێوەکان دەڕوانن و خوشحاڵ دەبەن، کێو خۆی دایکە وهەمووی گیایەکان و خواردەمەنیەکان لێ دەزایەن، کێو بۆ کوردان لە درێژای مێژوودا گەوردترین و باشترین پەنا گا بوە هۆی پارازتنی نەتەوەکەمانە بە شیعرەکانی مامۆستا قانیع لەم باردوە بڕوانن.<br>قەلاّی هۆز و کەل شاخی هەورامان پرسیارم هەیە دەستم بە دامان | | |
| ٣١١ | وونا | بن، مەیدان |
| وونا = بن، وون بە زاراودی هەورامی یانێ بن، بنی شت، بنی‌دار، بنی کیا بنی ئاو، بنی داروەن، بناغەی هەر شتێك و بن تولّی (ناوی جور | | |

| | | |
|---|---|---|
| باڵندەی بچوکێکە. | | |
| ٣١٢ | هواواتا | خوا |
| هواواتا خوا بە ریزی ٣٠٣ بڕوانە. | | |
| ٣١٣ | ماونگا | مانگ |
| مانگ ئەستێرەی مانگ کە لە راکێشەری خور دا و نیزیکی کاکێشانی خوردا قەراری گرتو و ئێستا مردوە و خۆی روناکی نیە و روناکی لە خۆر دەگرێ کاتێ کە نوری خوردەدا لە مانگ و مانگەشەوە، روناکیەکەی لە شەودا دەکەوێتە رووی زەوین و کاریگەری دەخاتە سەر جەزر و مەدی دەریاکان. ئەستێرەی مانگ بەو جۆرە کە چەسپاوە ژیانی تێدا نیە. | | |
| ٣١٤ | رۆچ | رۆژ |
| رۆچ، رۆژ بە زاراوەی هەورامیە بە جێگای روژ رۆچ ئەلێن کە رۆژ ئەو کاتەیە کە تیشکی خۆر دەداتە ئەو پارچەی زەویو ئەو کات رۆژە کە بەرەبەرە زەوین دەگەرێ و لە تیشکی خۆر لادەدا ئەو کات شەوە بەلاّم لە بەشێکیتر لە سەر زەوی رۆژە، و هیچکات تیشکی خۆر لە تەواوی زەوین لاناچێ مەگەر لە کاتی کسوفدا، یانی مانگ بکەوێتە نێوان خۆر و زەوین و ئەو کات ئەلێن خۆر گیراوەخۆرگیران. | | |
| ٣١٥ | خشپا | شەو، شەپ |
| وادیارە لە زبانی ئاڤێستاییدا زۆربەی ئەو ووشانە دەبنەشین و شین لە هەوەڵیانەوە هەبێ پیتی (خ) کە هەر وەها لە ووشەی شەشدا هەم بۆی زیاد کراوە بۆ درێژەی دەنگی ووشەکە، مرۆڤی ئاوێستایی کە کاری کەم | | |

| | | |
|---|---|---|
| بوە خوشی هاتوە لەم دەنگانە، شەو لە کاتی خۆر رویشتندا دێت و ئەگەر مانگە شەو نەبێ. لەو کەرتەی زەویندا تاریکی دەبێ چونکە نە مانگ و نە زەوین خۆیان تیشکیان نیە بەلاّم ئاگر روی زەویش تیشکی هەیە و لێدانی دوو شتیش بریقەی رونی هەیە و لە پێشان ووترا خشوە شتی یانێ شەش کە (خ) لە هەوەڵیەوە هاتوە. | | |
| ٣١٦ | ورشا | دار، درخت |
| داریا درخت لە زاراوەی هەورامیدا درەختەکە زۆر گرنگە کە دار لە ئایینی زدرتەشدا خۆی یاسایە، هەر کەس دارێك ببڕێ وەکوو قەتڵێ وەهایە، هەر وەها مرۆڤ لە بان ردستە گیانلەبەراندا لە لوتکە فراژ و ژیان ئارامی و قەراری گرتوە خودی داریش لە رەستە گیایەکاندا لە لوتکە فراژ و ژیان ئارام و قەراری گرتوە، دار و مرۆڤ هەر دوو برای یەکترن، هەر دوو بە یەك نیازیان هەیە (بۆمانەوە) . | | |
| ٣١٧ | تشتریا | ئەستێرەی تایبەتی کە لە ئاوێستادا |
| ستایش کراوە دەبێ ئەستێرەی موشتەری بێ کە زۆر گرینگە و رەنگە ژیانی تێدا بێ یەکێ لەو ئەستێرانەیە کە لە راکێشەری خۆر داماوە و وەستاوە کە خۆر دارای ٩ ئەستێرەیە لە جازیبەی خۆیدا | | |
| ٣١٨ | ئاندێرا | ناوی ئێزەد بە زبانی سانسکریت |
| ئاندیرا ئیزەدە کان وەکومیترا کە خوای هاوبەشی هیندیان و ئێرانیەکان | | |

(کوردەکان) بوە، هەر کات ناوی ئێران دەبەم یانی کوردان، ئیندیرا، گاندی و گاندی کچی ئەو هەڵگری ئەم ووشەی ئیندیرا بوونە، ئێستاش ئەم ووشەباوە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣١٩ | ئەژی | | ئەژدیها |
| ئەژی و ئەزیانێ ئەژدیها مارکاتێکە زۆر گەورە و زل بێ و شتان قوت بدات پێ ئەڵێن ئەژدیها، بە زوحاکیش ووتراوە ، ئەژدهاك بە کەسێکە تێر نەبێت و زۆر بخوا و تا بتوانێ ماڵی خەڵك بخوا پێ ئەڵێن: ئەژدیها گیان لەبەرێکە لە سەرزەویندا کێش دەکات. | | | |
| ٣٢٠ | پایتی دانا | | ئەوەی کە روومەت دەپوشێ |
| ئەوەی کە رومەتی دەپۆشێ لە زبانی ئاڤێستایی دا پێ ئەڵێن پایتیدانا. | | | |
| ٣٢١ | سەردوارا | Saravara | خود |
| ئامێری جەنگی کە لە کاتی شەڕدا دەیکەنە سەر کلاّو خودیاخودی پێ ئەڵێن کە سەر بەرەو خوارە یانێ ناوەکەی خاڵییە وەکوو قاپلۆخی کیسەڵ یا خودی کلاّو وا دەزانم ئەو کات لە مس دروس کراوە. | | | |
| ٣٢٢ | کەمەرا | Kamara | کەمەر، کەمەربەند |
| کەمەرایا کەمەربەند یا کەمەر | | | |
| ٣٢٣ | راناپانا | Rana pana | رانی سەرو |
| ئەو شتەی کەران دەپارێزێ، پانایی ران، کەشاڵەی ران | | | |
| ٣٢٤ | سپەرا | | سپەر |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٢٥ | فراداکشنا | Fradakshna | قەڵماسك، |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | | کێش |

فراداکشنا قەڵماسك یا کێش که لە قەدیمدا قەڵماسك لە بەن دروست دەکراو و بەردیان پێ دەهاویشت کە لە شەڕی گزنفون لە گەڵ کورداندا، کوردەکان لە قەڵماسك و تلوکردنی بەرد کەڵکیان وەرگرتوە بە وتەی گزنفون.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٢٦ | شناڤەرە | Shnavare | زێکەوان |

زی کەوان یا ژی کەوان کەوان ئامێری جەنگاودران بوە، هەر وەکوو قەڵماسك کە لە شەڕدا ئەوانەی کە تیر و کەوان کار بونە وە ئەوانەی قەڵماسك کار، هەر کام بۆ خۆیان ڕێز و ریزی جیاوازیان هەبوە وەکو ئەمڕۆ کە ریزی پیادە نیزام، ریزی ئەندازیاری و...

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٢٧ | تەنڤان، تەن ڤەر | Tanvanctanare | کەوان |

وە ئەمڕۆ ریزی موشك، ریزی تانك زرێ پوش و ... بە جیا نەبەرد دەکەن.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٢٨ | ئیشو | Ishu | تیر، ئاسنگی نوك تیژ |
| ٣٢٩ | خەرکاسوپەڕنا | Kharkaso parne | پەڕی داڵە کەرخۆر، |

داڵە کەرخۆر زۆر لە گەڵ ووشەی خەرکاسودا نیزیکە (خەر یانی کەر) (کاسویانێ بەلای سەرا بە لای کێودا) کە داڵە کەر خوریش ئەمە تەعریفیە کە بە لای کێوان و بەرزیان دەفرێ. وە زاراوەی فەیلی وە

| | | | |
|---|---|---|---|
| جێگای کەر خەر ئەیشون. | | | |
| ٣٣٠ | کەرێتا | Kareta | کارد |
| کارد بۆ ئیش و کاری جێگای چێشت لێنانە (ئاشپەزخانە = یانە و سازکردنی ئاش و خواردەمەنی (چێشتخانە) کارد بۆ کوشتنی خەڵکی ئاسایی و خزم و خوێش نیە، ئێستا کارد لە ئیستیل یا ئاسنگ ساز دەکرێ لە سەردەمی لەمێژینەدا لە بەرد و دار ساز کراوە، بۆ بەرگری لە مرۆڤ و نیچیری گیان لەبەران. | | | |
| ٣٣١ | فشویت | Fshuyat | کشت و کاڵ، وەرزێری |
| ووشەی فشویت کە بە مانای کشت و کاڵ بێ دەبێ بە مانای فش کردنی زەوین بێ کە لە زاراوە ئەردەلانیدا زۆر بەکار دەبری بۆژیر و رو کردنی زەوی و فش کردنی، زەوی نەرمیش پێ دەڵێن زەوینی فش، قەلەمونیش کە باڵ فش دەکاتەوە. | | | |
| ٣٣٢ | ئایروی ڤەرز | Aiurvarez | کشت و کاڵ، وەرزێری |
| ئاشکرایە ئەم ووشانە لە زبان ناسیدا زوو بە زوو مانای دەرئەکەوێ کە کشت و کاڵ وەرزێری و وەرز (ڤەرز) لە گەڵ ووشەکانیشدا ووشەی سیستەمی کشت و کاڵن. | | | |
| ٣٣٣ | یاوکەرشی | Yaokarshti | تۆم وەشان |
| لە پێشان مانای کەرشی (مان)کرد کە بە مەیدانی کار،ئێستاکە یاو بە ووشەی کەرشی زیاد کراوە بۆتە تۆم وەشاندن کە ئەو کەسەی تۆم دەوەشێنێ دەبێ ئاستێ بۆ مەیدانی تۆم وەشاندنەکەی دابین کات کە لێ | | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| تێك نەچی دوبارە بیودشێنێ. | | | |
| ٣٣٤ | ڤای‌دی | Vaidhi | کەش و هەوا |
| ووشەی ڤای دی بە ماناکەش و هەوا، کە دەگونجێ کەڤای لەوا با بێ، چونکە با یاوا یاڤا خۆی بەشێکە لە کەش و هەوا هەرچەند ووشەی هەوا لە عارەبی گیراوە، یمشی علی الما والهوا، بۆ کراماتی ئەولیا دەڵێن. | | | |
| ٣٣٥ | یورود | Urudh | رۆ، رووبار، جۆگەی گەورە |
| یورود بە مانای رۆ، رۆبار ، جۆگای گەورە رووبارەکان لە کانیەکان و ئاوی باران پێك دێن بۆ نون سیروان لە ووشە سی وروان کە کۆی رویەکان تێکەڵ کراوە یانێ سی رۆ (رۆبار) بۆتەیەکی و ناوی سیروانی لێنراوە. سی‌روان = سی روبار یا سی رووار. | | | |
| ٣٣٦ | ئەرڤەرا | Urvara | روکە، سەوزە |
| ئەو شتەی کە لە زەوی دەڕوێ، سەوز دەبێ. | | | |
| ٣٣٧ | چایتی‌چات | Chaiti Chat | چا |
| چا لە زەوی هەڵدەکەنرێ بۆ دەرهێنانی ئاو لە ژێر زەوی، چای کاریزیش وایە بەلاّم ووشەی بیر لە بنری عارەبیە،چا کوردیە لە زاراوە ئەردەلانیدا چای پێ نەڵێن. | | | |
| ٣٣٨ | ئاڤاکەنە | Avakana | نیستەخر، کەناو، حەسێڵ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| جێگایێك كه ئاو لەوێدا كۆ دەبێتەوە وەكوو حەسێڵ كه بۆ ئاویاری كشت و كاڵ به كاری دەهێنن چونكه كاتێكه ئاوی كانی له حەسێڵ دا كۆ ببێتەوە ئەو كات له گۆنجی یا كونجی حەسێڵەكەوە، ئاوه كه دێته دەرێ و به باشی ئاویاری پێ دەكرێ كه هەڵبەت بەشتێك كونی حەسێڵەكه دەگرن تا پڕ دەبێ، دوای پڕ بوون بەری دەدەن. | | | |
| ٣٣٩ | پاراكەنتی | Parakanti | پەراكەنندە |
| زەوینێك نەرم و هەم وار و ساف كرابێ (ڕێك كرابێ) بلاّو و فش كرابێتەوە. | | | |
| ٣٤٠ | زەم كەرشی ئەم راودەم | Zamkarshyam raodham | زەوینی بەرهەمدار زەمینی بەرهەمدار |
| ٣٤١ | گرێدا | Geredha | كون |
| گریوایا گرێدا كه به قورگ و گەڵوش دەووترا لێرەشدا موناسبەتی هەیە چونكه قورگیش كونە. | | | |
| ٣٤٢ | توشیش | Tushish | تەشوێ، بێڵ |
| تەشوێ، له قوشیش داتاشراوە بۆته تەشۆی هەر بەم تەشوێ تاشراوەته شۆی دەووترێ توشیش. | | | |
| ٣٤٣ | پرتو | Peretu | پرد = پێڵ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| جیاوازی زۆری نیە پردیاپێڵ، سەرپیل زەهاو، پرد لە بان ئاو یـا دەریـا یا رووبار و دەرە ساز دەکرێ بو ئاسانکاری هاتووچوو. | | | |
| ٣٤٤ | فشوتا | Fshuta | پەنیر |
| ووشەی فشویت و فشوتا زۆر نیزیکن بەڵام لێرەدا فشوتا یانێ پەنیر کە خۆی نەرم و توردە = فشە. | | | |
| ٣٤٥ | بەشی | Bashi | خەیار |
| بەشی یانێ خەیار لە زاراوە ئەردەڵانیدا بە خەیاری سەوز، سەوزەخەیار، بەیوتیر تورووزی یا خەیار چەمبەر دەڵێن. | | | |
| ٣٤٦ | مەدو | Madhu | مەی، خواردنەوە |
| ٣٤٧ | مەرز | Merezu | مەرز |
| مەرز کوردیە بەڵام سنوور لە کوردی ئاچێ جیایی نێوان دوو هەرێم خاکی یا دو وڵات، مەرزی پێ دەڵێن، مەرزی کوردستان لە گەڵ... | | | |
| ٣٤٨ | یەڤە | Yavahe | غەللە کەلەزاراوەی |
| هەورامیدا یەو یانێ جو، دیارە جۆلە گەنم گرینگتر بوە کە هەموو غەللە، خەلە بە ناوی جۆ= یەوە ناو براوە | | | |
| ٣٤٩ | ڤەنە | Vana | وەن یا بن بە مانای |
| لێـردوار (جەنگـەل) داری وەن لـە کێوەکـانی کوردسـتاندا هەیـە لـەو جێگایانە کە جەنگەڵ هەیە دەڕۆی. | | | |
| ٣٥٠ | وەفرا = بەفر، وەرکە = بەرگ | | تەچا = یاوەچێ، رەوان |

| | | | |
|---|---|---|---|
| وەفر زاراوە هەورامیە. | | | |
| ٣٥١ | وارە | Vara | بارین |
| باران بارین بەفر بارین، بەردبارین کە ئەڵێن نیزیکەی شەست میلیون ساڵ لەمەو پێش بەردێك زۆر زل باریوەتە (کەوتۆتە) سەرزەوین هەموو دایناسورەکان و گیان لەبەرانی تری کوشتوە و نەسلی یان دوایی هاتوە هەر دەبێ (حجرالاسود) یش بەم جۆرە بێ کە حاجیان دەبێ دەستی لێ بدەن. | | | |
| ٣٥٢ | ڤەرە | Vara | بارە |
| ٣٥٣ | ویش ئاپەهێ | Vishapahe | شتێك لە ئاو زاراوکا، ژار |
| ٣٥٤ | ڤەتڤا | Vathva | گەلە، ران |
| ٣٥٥ | هوشك | Hushka | وشك |
| هویشك یاووشك کە هویشك بە ئیشمام زاراوەی کەلوری و فەیلەیە | | | |
| ٣٥٦ | ئەزرا | azra | زەوینی کشت، مەزرا |
| موچە و مەزرا، مزرعەی عارەبی لەم ووشە دانراوە، ئێستا لە زاراوەکانی سورانی، ئەردەلانی و ... بە جێگا ئەزرا کە پیتی ئەلەهەوەلیەوەیە مەزرا دەووترێ کە پیتی مە = ئە | | | |
| ٣٥٧ | ئاڤێستایی | Washyait | وەش یا پیتی =کوێخا |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٥٨ | راوته | | رو، رووبار |
| که له ریزی ٣٣٥ راڤه کرا. | | | |
| ٣٥٩ | ڤەیا | Vaya | مر، مریشك |
| تیٚناگەم بەلاّم ئەم ووشە بە مرو مریشك ووتراوە مریشك لـە هیلکـە و هیلکە لە مریشکە دەبیٚتـە دەور، بـاش نـازانریٚ کامیـان لـە پیٚـشان ئافریدە کراوە بەلاّم ئەگەر بە چەمکی داروینـن بـڕوانین مـر لـە پیٚـشان بووە، کە لە رەستەی باڵندەکانە . | | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٦٠ | گاوارشەن | Gaoashan | گایێنیر |
| بە ریزەکانی پیٚشوو بڕوانە. | | | |
| ٣٦١ | گاودایە دایکی گاو یا باوکی گـاو دەبیٚتـە شـوان شـوان کەوایـە شوان، گا و مانگاکانی سەرنەبڕیوە چونکە دایکە یـا باوکـە بـۆ گاکان. | | |
| ٣٦٢ | گاڤ دەنا | Gav dhana | گاودان |
| جیٚگای گا، گاوداری، ووشەی دان تا ئەو جیٚگایە من دەزانم بە مانای جیٚگایە، هەر شتیٚك بیٚت وەکوو ئاودان هەم بە مانا ئاودیٚران دەوتریٚ و هەم بە حەسیٚلْ جیٚگای ئاو یا میٚزلْدان = مەسانە و... | | | |
| ٣٦٣ | ڤاستیرگاڤیایتی | Vaster Gavyaiti | لەوەرگەی گاوی |
| ٣٦٤ | گاوازی | Gzoazi | گاوی شیر = مانگا |
| گای بارکیش، وەرزاد = گای کشت و کالْ، گاجووت. | | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٦٥ | گاوتا | Coetha | فوسیلەی گاوی |
| ٣٦٦ | گایتوجین | Gaetho | گالیخۆر، قەمچی‌کە |
| گای پێ لێدەخورن. | | | |
| ٣٦٧ | گاویانەم | | تەوێڵە، یانەی گاو |
| ٣٦٨ | گاڤەن | Gavan | ئەوەی کە بە گا پەیوەندی |

هەیە ووشەی زۆر سەبارەت بە گا لە زبانی ئاوێستایی‌دا هەیـە، بـەلاّم دەرفەت نیە هەمووی بنووسم و ئێستا وولاّت خەریکە پێ دەنێتە قۆناخی پیشە سازیەوە وە هەر چەند کشت و کاڵ بناغەی پێشکەوتنی ئـابووری وولاّتە جا بۆچی ئەوەندە سەبارەت بە گا لە زبانی ئاوێستاییدا ووشە هەیە بۆ ئەوەی،گا سوودی زۆری هـەبووە بـۆ مرۆڤـی کـورد تـا ئـەو جێگایـە داستانێك لە کوردەواریدا هەیە کە ئەڵێن گوێ زەوی وا لە بان شاخی گاو وە ئەویش والە بان ماسی، ماسیش وا لە بان ئاو (دەریا) بومەلەرزەکـە دێت ئەوە تاڵە موویێك لە گا دەلەرزێ هەڵبەت ئەمە چیرۆك و ئەفسانەیە و لە بەر سوودی بۆ مرۆڤی کورد دروست کراوە تـا ئـەو جێگایـە مرۆڤـ گای پەرستش کردوە وەکوو هندوەکان، کە هەر وەها عارەب گرینگی بـە وشتر داوە وشتر ئەو هەموو نێوانەی هەیـە، لـە ووشـتری یەکـساڵە، دوو ساڵە، سێ ساڵە، چوار ساڵە نێر و می و ... ووشەی بۆ دانـاوە چـونکوو سـوودی هـەبوە (بـۆ مرۆڤـی عـارەب) عـارەب تەنانـەت زۆربـەی هەڵپەرکێ‌کانیان لە ووشتر گرتوە وە لەبارەی سەگ لە ئایینی کورداندا و لە زبانی ئاوێستاییدا زۆر گرینگی پـێ دراوە، سـەگ بـۆ کـشت و کـاڵ

کارانی کورد زۆر ئازیز بوە وە لەبارەی سەگەوە ووتویانە سەگ جارێك وەکوو سەرباز لە گەڵ دوژمندا شەڕ دەکا، جارێکیش ناز دەکا وەکوو منداڵاُن کایە دەکات و لە قەناعەت و فروتەنیدا وەکوو پارسا یان وەهایە وە لەچەور زوبانی و چاپلوسی‌دا وەکوو کویلەی زەرخریو، سەندراو وەهایە نیگابان و پارێزەری مەڕ و ماڵاتە، سەگ هەوەڵین گیان لەبەرێکە لە وەحشی و هوڤەکە بۆتە ئەهلی و هەوەڵین دوست و هاوڕێ وەفاداری مرۆڤە، کەمتر گیان لەبەرێکی درەندە هەیە بە ئەندازەی سەگ وەفادار و نمەك ناس بێ وە لە نێوان بڕێك لە کورداندا سەگ دارای ڕێز و ئیحتیرامی تایبەتیە تەنانەت مراسم تەعزیە خوانی بۆ دادەنێن کە جەسەدی لە گۆڕی سەگاندا دەنێژن کە هەڵبەت ئەم کارە بەلای منەوە کارێکی پەسەندە لەبەرچەند هۆیەك :

١. ڕێز لە وەفاداری سەگ.

٢. ڕێز لە سورشت و ژینگە.

٣. ڕێزنان: لە بێ داشت و ساقی مرۆڤ و گیان لەبەران و گیایەکان، ئێستا بڕێك لە ناوە ئاوێستایەکانی سەگ کە چەندین نێوی هەیە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٦٩ | سپەیو پەشوش هاروە | Spay pashush haurvo | سەگی نیگابان |
| ٣٧٠ | سپەیوڤیش هارڤە | Spayo Vish haurvo | |
| سەگی نیگابانی دێ | | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ۳۷۱ | سپەیو و هونەزو | Spayo honu nazo | |
| سەگێك کە هێرش دەباتە سەر | | | |
| دژمن یا بۆ دژمن نیانگیرە یانێ بەکەڵوە دژمن زامدار دەکات | | | |
| ۳۷۲ | سپەیو دوراختو هونەرو | Spayo Durakhto Hunaro | |
| سەگی کە کایە دەکات و هونەر نیشان دەدات | | | |
| ۳۷۳ | سپەیوتارونو | Spayo Tau runo | |
| سەگی نێچیر تانجی، تاژی کە ئێستا بەسەگیش ئەڵێن سپلۆت | | | |
| ۳۷۴ | Pisra | ئاسنگەری یا زەرگەری | |
| پیسرا لە ریشەی pis یانێ جوان کردن، زەرگەر و ئاسنگەر مەتاڵەکە جوان دەکات | | | |
| ۳۷۵ | زەرانیو سایپا | Zaranyo Saepa | زەرگەری |
| سیپە یا سایپا لە ریشەی Sip یانێ کونا کردن | | | |
| ۳۷۶ | ئیرێزاتوسیپا | Erezato Saepa | مس گەر |
| ۳۷۷ | رەن یومینا | Ran yo mina | گەردبەند |
| ۳۷۸ | تەشتە زەرانینا | Tashtazaranima | تەشتی زێرین. |
| ۳۷۹ | ئەشترا زەرینوپیسا | | خەنجەری زەرین و جوان. |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٨٠ | فراهیچ | FraHic | |
| کوڕەی ئاسنگەری. پێوەندی هەیە بە هەزارەی دووەم پێش لە ز. | | | |
| ٣٨١ | ئیسکایریا | | زوخال |
| ٣٨٢ | ڤەسترا ئابدەئینا | Vashraubdaena | پارچەی دوراو جل و بەرگی چەرمی |
| ٣٨٣ | ئیزینا ڤەسترا | Izac na vastra | پارچەی دوراو لە مووی بزن. |
| ٣٨٤ | ڕەتا | Rata | گەردونە، ڕەزم و شەڕ |
| ٣٨٥ | ئەشا | Asha | گەردونە عادی، ئاسایی |
| ٣٨٦ | وشایا ئەشا چەتر ویجتا | | گەردونەی چوار ئەسپ |
| ٣٨٧ | وی زوتا | Vizuta | بازەرگانی |
| ٣٨٨ | شوسیتم | Shustem | شورباگ، شوراو |
| ووشەکان کە پێوەندیان بە ژن و ژنخوازی هەیە | | | |
| ٣٨٩ | ئەگرو | Agru | ژنی بێشوو، بێوەژن |
| ٣٩٠ | ستاتورەتو | Stato Ratu | |
| کچێکە لە ڕێ نوێنی باوك و دایکیدا بێ | | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٩١ | ئەستاتورەتو | Astato Ratu | |
| کچی خودسەر کە قەیومی نەبێ وا دیارە (ئە) نیشانەی نەفیە، نادارە | | | |
| ٣٩٢ | پەرەداتا | Paradhata | کچێ کە دەزگیرانی کردوە |
| ٣٩٣ | ئوپەرەداتا | Oparadhata | کچێ کە دەزگیرانی نیە و خوازبێنی نەکراوە |
| ٣٩٤ | نایریت ڤەنا | Nairith vana | داب و نەریتی کوێخایی |
| ٣٩٥ | ڤەڤەد | Vaoh Vad | تەهول = تەئەهل هاوسەری هەبێ — قازاق نەبێ. |
| ٣٩٦ | ئەپاڤەد | upavadh | زەماوەن کردن |
| ٣٩٧ | ئازڤەد | Uzvadh | بەرگری کردن لە زەماوەن |
| ٣٩٨ | خشودرا | Khshudhra | توخم، نوتفە، تۆم |
| ٣٩٩ | چەرایتی | Charaiti | کچێ کە شووی نەکردوە |
| ٤٠٠ | چیترا | Chithra | نژاد، نەسل، ئازا |
| ٤٠١ | جەیە | jae | ژنی خراوکار |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ۴۰۲ | جایش | jaish | خراپکاری |
| ۴۰۳ | نەڕا | Nara | نێر، پیاو |
| ۴۰۴ | نایری | Nairi | ژن |
| ۴۰۵ | پەرەنایو | Parenayu | گەنج، برنا |
| ۴۰۶ | بەرێترا | Barethra | ژنی ئاووس، باردار |
| ۴۰۷ | مەگا | magha | گەنجی بێژن |
| ۴۰۸ | ڤەنتە | Vante | ژنی پاکدامەن |
| ۴۰۹ | ڤەرتو | Uarto | خۆش ئەندام خوش چێرە |
| ۴۱۰ | ویدڤا | Vidhua | بێوە |
| ۴۱۱ | ویباختی هوڤا | Viyakh tihava | ژنی ئارایش کراو |
| ۴۱۲ | شایتو | Shaito | شادی کوێخا |
| ۴۱۳ | سەیە | Sae | هەتیو |
| ۴۱۴ | ستری | Stri | ژن (ژین = Gen) |
| ۴۱۵ | سریراو | Srirao | خوش دیدار |
| ۴۱۶ | هوتەشتو | Hatashto | خۆش ساخت |
| ۴۱۷ | هوویرام | Haviram | خۆش تەن |
| ۴۱۸ | باختەر یا ئەختەر | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| باکور کە ئێستا خاوەر و باختەر یانێ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا | | | |
| ٤١٩ | دەشن | | باشور |
| ٤٢٠ | ئەشەس یا وەترا یا خۆر ئاوەر | | خۆر هەڵات |
| ٤٢١ | خوربەر | | ڕۆژئاوا |
| ٤٢٢ | گیتی یا گای تا | ڕووی زەوی یا گۆی زەوی | |
| ٤٢٣ | وایو | | با |
| ٤٢٤ | واو | | ئاو، ئاوا |
| ئاو مایەی ژیانە لە ئیدروژێن و هێدروژێن تێکەڵە. | | | |
| پزیشکی لە سەدەمی لەمێژینەدا بیماری و نەخۆشیەکان بە چەند جۆر موعالجە دەکرا. | | | |
| ٤٢٥<br>بە هـوی ئەفسون کە جۆرێك هیپنوتیزم بـۆ، پزیشکی بەم جـۆرە mathro Baeshaza (مەترو بیشازا)یان پێ دەگوت کە مـوو بـە دیاکەسی پارسای بە ناوبانگ ئـەم کـارەی دەکـرد کـە فـوی دەکـردەوە بیماردا یا ئاوی ئەفسون کراوی بە ئـەو دەدا کـە بیخواتـەوە و دوعـای دەخوێند و ئەهریمەنی سوێند دەدا کە دەست لە بیمارەکـە بـەردا، بـڕێ جار تە عویز و تەلەسمی پێ دەدا کـە لـە گـەردەنیا ئـاوێزانی کـات یـا بێبەستێتە قۆڵیەوە. | | | |
| ٤٢٦<br>جۆری دوهەم پزیشکی گیاییی( یا گیایی دەرمانی) Urvaro bae | | | |

shaza یورڤەرو بیشازا بوو کە تایبەتمەندی گیایەکانی بە ئەزمون دەزانی و بیماری تەشخیص دەدا بەرامبەر ئەزمونەکەی خۆی ئەو گیایە یا چەند گیای پێکەوە تێکەڵاو دەکرد و دەیدا بە نەخۆش کە هەڵبەتە بەڵگەی زانینی تایبەتمەندی گیایەکان لە سەردەمی لەمێژینەو باستانیدا وەکوو ئەمڕۆ پێشکەوتو نەبوە.

٤٢٧

پزیشکی نیشتەرگەری و جەڕاح Baeshaza Kareto Baeshaza یا پزیشك بە مانای دەرمان کردن و Baeshayaj بە مانای تەن دروستی و خوشبوون لە بیماری .

## ناوی بیماریەکان و نەخۆشیەکانی سەردەمی ئاڤێستا کە بڕێکیان دەزانین و بڕێ تریان نازانین

| | | |
|---|---|---|
| تەفنو | | یاو. تەو |
| دوزو | | تەوی زۆر گەرم |
| سەرستی سەرنا | | نەخۆشیەکانی سەرو بیماری سەر |
| پیسو | | نەخۆشی پیسی |
| پامەن | Paman | گول نەخۆشین گولی کە لوت و چەناکەی دەریزێ = جوزام. |
| گەرینو | Gareno | گەڕی |

| | | |
|---|---|---|
| زەرنیش | Zarnesh | خوران، دومەڵ |
| ڤەڤیرشی | Vavershi | زەعف هێزی باە = هێزی سیکسی کەم. |
| زواشنویە | Zoishnye | بەشێك لە تەو |
| زوشنی | Zoshin | لاغری، ناتوانی |
| سکێندا | Skenda | جەردیان و گەڕانی خوێن — زام، شکاو |
| ئەغوستی | Aghosti | لەرز |
| دەروکا | Daruka | بەردی مەسانە (مێزڵ دان) |
| کوروغا | Kurugh = H | سورێجە، مەخمەڵەك. |
| وەزێمنونەستی | Vazemno Asti | تەوی دەق، سل |
| ئەندا | anda | نابینا،کوێر بە هیندی ئەندها |
| کەرێنا | Karena | کەڕ |
| دەرڤا | Darva | لەنگ شەل |
| مورا | Mura | لاژو، نەحمەق |
| ئارا | Ara | شەل — لاڵ |
| روغا | Rogha | شەل — شەلین |
| ئاپەکو | Apakava | کوم — گوژپشت بان پشتی قوز وەکوو وشتر |
| ئاپاڤیا = | Apavaye | دیوانە — شێت — لاڵ، سەر زبان |

| ئاپەکەڤا | | دەگرێ |
|---|---|---|
| کەسڤی | Kasvi | خوار – پەست – قەدکۆتا – کورتە بالاّ |
| ڤینتو دەنتون | Vineto Danton | درێژ دیان – درێژ ددان. ددان کەروێشکی. |
| ئەستایریا | Astairya | هاوڵە – ئابلە – ئابلە. |

# وڵاتی ئاریایەکان

سەغد، هەرو، یەخدی (بەلخ)، یەنسا، هەرایو (هەرات) وای‌کرتا (کابول) خەنشا یا وەهەرکانا (گورگان) هەرەهویتی (بە زمان سەنسکریت : سرس وەتی) های تۆ منت، (هیرمەند هیلمەند) راگها یارەغە (رەی — رازی)، کەخرا، وێرنا، لێرەدا فەریدون لە دایك بووە، هەفت رود (پەنجاب)، سەر زەوینی روباری رەنگ رەوانە ئەم وڵاتانەش لە سەردەمی هەخامنشەکاندا بەشێك لە ئیمپراتوری خەمەنش بوە.

| | |
|---|---|
| ئەربابا یا ئاربابای بانە | عارەب |
| مەدرایا | میسر |
| ترای دەریا ئەولای دەریای سپی | |
| سپەروالیدی کە ناوەندەکەی سارده ئەناتول | |
| یاوئا | یونان |
| مادا‌باکووری ئێران ئاتورپاتکان (ئازەربایجان) | |
| ئەرمنیا | ئەرمەنستان |
| کەتەپەتوکا | لە ئاسیای بچوك |
| پارتوا | پەهلو — تەبەرستان |
| زەرنکا | سیستان |
| هەرایو | هەرات |
| ئوورزدمیا | خواردزم |
| باختریش | باکووری ئەفغانستانی ئێستا. |

| | |
|---|---|
| سەعدا | ئوزبەکستانی ئێستا |
| گەندارا | باکووری رۆژئاوای پەنجاب |
| مـــاکا | کشوەر وە وولاتی سیت یا ئەسکیت |
| سەتەگوش | کابول |
| هەر و وەنیش | هیلمەند (یا زەوێنێ لە باکووری) هیلمەند. |
| ماکا | موکران |

دوای نووسینی نیزیکە زیادتر لە چوارسەد و پەنجا ووشەی ئاڤێستایی و نووسینی کوردی ئەو وشانە کە هەڵبەت برێك زۆر لە ووشەکانی ئاڤێستایی لە مانادا لە گەڵ ووشەکانی کوردی ئەمڕۆ هاودەنگ بوون و زۆربەی بە کەمێ رێك و پێك کردن و یاداتاشین خۆی ووشە کوردیەکەیە هەر وەها تا ئەو جێگایە توانیم زۆر لە ووشەکان لە بابەت مێژوویی و زانستی و ... یەوە راڤە و شرۆڤە کەم جا ئەگەر کەم و کۆڕێك یا هەڵەیێك لە ووشەکاندا و یا لە وەرگێڕان و تەفسیری ووشەیێك هەبێ داوای لێ بوردن دەکەم هومیدەوارم، ئەوانەی کە زانایان هەیە و دڵسۆزی گەلە کەمانن بە نووسینی فەرهەنگ و زبان و داب و نەریتی گەلی کورد کە وەکوو ئوقیانووسی لە دوایی نەهاتوە خزمەتی بە کەڵك و شایانی ئەم نەتەوە چەوساوە بکەن و بە دوژمن نیشان بدەن کە لە هەموو بار و بوارێکەوە توانایمان هەیە، ئەوەش بڵێم زۆربەی ئەم ووشەی

ئاڤێستاییانەم لە کتێبی تاریخ و ادبیات عصر اوستانی (تاریخی ئەدەبیاتی عەسر ئاڤێستایی) لە نووسینی پروفیسور عەباس مهرین کە بە زبانی فارسی نووسیویەتی و بە داخەوە ناوێکی لە کورد نەبردووە.
ئێستا پاساودەلیلی ئەوەی کە بۆچی لە سەرجەلدی ئەم نامیلکەیە نووسیوە مە زبانی ئاڤێستا (ئاوێستا) سەرچاوەی نووسراوەی زبانی کوردی و سەرچاوەی زبانی سانسکریت و کتێبی موقەددەسی ریگ ڤیدا هەر دوویە بڕوانن!
بە ئەم داستانە و ئەم روداوە بێ وێنەیە، هەرکەس دەیەوێ کە لە نەزانین و تاریکی رەهایی هەبێت و بە شوێن خورافات و گومان دانەروا ئەم رووداوە گرینگە بخوێنێتەوە.
کورتەیێك لە روداو باسی زەردەشت و زانای هێندی ویشتاسبشا.
ئیدموند بوردوزیکلی Edmond Bordeaux Szekely ماموستای زانکۆی کالیفورنیا کە لە بابەت ئاڤێستاو زەردەشت و دینی زەردەشتی باوەڕ و چەمکی نوێی هەیە کە دارای ژمارەیێك کتێبە کە ئەم کتێبانە لە شەش جلد دا بە ناوی Theworld picture of zarathushtore کە لە سالّی ١٩٥٣ی زایینی دا لە ئەمریکادا چاپ بووە، لە کتێبی هەودلّ لە شەش کتێب یا دەفتەری دا ئەم کۆمەڵە باسەی وتووە کە بەشێکی زور نوێی و سرنج راکێشەر و دلّبەری تێدایە کە لە بارەی زەرتەشت و زانا و حەکیم و فیلسوفی هیندی بە ناوی چینگرەنگهاچە Cengranghaca باسی دەکات: لە لاپەڕەی ٩ تا ١١

که بە هۆی وەرگێڕانی ئەو هێناویە تا لە گەڵ دەقی مەنزومەی داستانەکەدا کە ریوایەتێکی دیکەی لە پاڵ یەکدا بن تا باشتر بابەتەکە بزانرێ ویەکێ لە ریوایەتی جێگای موتمانەی مەزدایی‌یە کە زۆر جێگای سرنج دانە لە ئەدەبیاتی سوننەتی زەردەشتی‌دا، ریوایەتی چینگرەنگها چە زانای هیندی و زەردەشت پەیامبەری ئێرانی و کورد کە لەم ریوایەتەدا فێر کردن و تەعلیماتەکانی زەردەشت و چۆنیەتی بنیات و بناغەی تەعلیماتی ئەو ئاشکرا دەبێ، بەرامبەر بەم ریوایەتە وەرگێڕییە: رۆژێك لە رۆژان، کاتێکە «ویشتاسب» پاوشای ئێران[٢٦] لە سەفەرێکی جەنگی دەگەڕایەوە گەیشتە جێگاێك کە لەوێدا زەردەشت قوتابییەکانی تەعلیم دەدا و فێری زانستیانی دەکرد و خۆشی لەو جێگایەدا کە باخێ بوو ژیانی بە سەر دەبرد ناوی زەرتەشتیش لەو سەردەمەدا ناوێکی بە ناوبانگ و جێگای سرنج بوو، شاماوەیێکی زور لە چاوەڕوانی هەلێك وەها بوو تاکو زەرتەشت ببینێ و چاوی پێ بکەوێ و لە باردی جیهان و ئافەرینش و خیلقەت و ژیانی و زۆر لە بابەتەکانی دیکە پرسیاری لێ بکا، کە ئەمانە پرسیارانێکن کە زانایان و فیلسوفان و حەکیمان نەیان دەتوانی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە، دوایی، شا و هاورێکانی هاتنە نێو باخەکەی زەردەشتەوە، پیاوێکیان دیت کە لە هەودڵەوە وا دیار بوو کە مامۆستایە کە قوتابیان دەوریان دابوو کە ئەم قوتابیانە لە کاتی ئیش و کار و

٢٦ . هەڵبەت لەو کاتەدا ناوی لە ئێران نەبوە بەڵام ئەو جێگایانەی کە لە ژێر فەرمانی ویشتاسب پاوشای پیشدادیان (کیانیان)دا بۆە وڵاتی کوردەواری بوە.

فێربوونی شێوەی کشت و کاڵ و پەروەردەی گیایەکان و دارەکان و دانەکاندا بوون، قوتابیان کاتێکە چاویان بە شا کەوت لە دەوروبەری مامۆستایان رۆیشتنە کنارەوە و رێگایان بۆ شا و هاورێیانی واز و ئاواڵە کرد. شا لە بەرامبەری زەردەشتدا راوەستا و وتی: وەسف و و ناوبانگی تۆم زۆر بیستوە و دەزانم کە پیاوێکی زۆر گەورە و زانای، من هاتومەتە لای تۆ کە لە بارەی رازی ئافەرینش و خیلقەت و یاساکانی سروشت و ئەوەی کە بەم جیهانی هەستیە نەزم و رێك و پێکی داوە پرست لیٰ بکەم کە ئەگەر بەراستی بەم جۆرە کە تۆ زاناییکی بە ناوبانگی وەلامی ئەم پرسانە بۆت هاسانە و من ناتوانم زۆر لەم جێگادا بمێنمەوە، چونکە بۆ بابەتەکان و موشکیلات و تەنگ و چەڵەمەی وڵات دەبیٰ هەرچی زووتر دوای ئەم پێودرو و غەیبەتە لە پایتەختدا نامادە بم.

زەردەشت لە حاڵێکدا کە بیرمەندانە بە ویشتاسب شادا دەیروانی، دانەی گەنمی لە زەوی هەڵگرت و نایە نێوی دەستی ئەو و پێی وت! ئەم دانە بچوکە گەنمە هەر کات بە باشی بیر کەیتەوە هەموو پرسیارەکانی تۆیی تێدایە و ئەم تەڵە (دانە) گەنمە لە بەرگیرندەی هەموو رازی ئافەرینش . قەوانین و نامووسی سوروشت و رێك و پێکی ئەم جیهانەیە، شا لەم وتە و کردارە سەری سوڕما و شتێکی دەرك نەکرد و نەیزانی، کاتێکە دەور و بەرەکە و هاورێکانی دیت کە پیٰ دەکەنن رق وکینەی بەسەردا زاڵ بوو، بیری کردەوە کە گاڵتە و سووکی پیٰ کراوە، ئەم جار دانە گەنمەکەی خستە رووی زەوی و روو بە زەردەشت وتی: من باوەڕم

وەها بوو کە تۆ زانایێکی گەورە و بێوێنە و بێ هامتای بەڵام ئێستا بە ئاشکرایی دەزانم و بۆم دەرکەوت کە تۆ پیاوێکی نەزانی کە ئەم نەزانینەی خۆت بە کردارەکانی بەلاجەوی و سەرسوورهێنەر تەوجیە دەکەی و دەیشاریتەوە منیش نەزان بووم کە کاتی پڕ ئەرزش و پڕ بەهای خۆمم لە دەست دا و هاتم بۆ دیداری تۆ، ویشتاسب (گوشتاسب) ئەم گفتانەی وت و مەزراکەی بەجێهێشت و بە لای پایتەختدا رۆیشت، زەردەشت بە ئارامی دانە گەنمەکەی لە زەوی هەڵگرت و بە بیر و ئەندیشەوە بەودا ڕوانی و بە قوتابیانی وت ئەم دانە گەنمە هەڵ دەگرم کە بە زوویی رۆژێك دێت کە پاوشا و ماموستاکەی بەم دانە گەنمە نیازیان دەبێ.

چەندین ساڵ لەم ڕووداوە گوزەرا، شا (ویشتاسب) هەر وەکوو پاوشایێکی پیرۆزمەند و پیاوێکی بەهرەمەند لە ژیانی پر نیعمەت و جوانی لە کاخی خۆیدا بە سەربەرزی ژیانی بەسەر دەبرد، بەلام رەوان و رووحی لە پێز و نیعمەتی زانستی و بیرمەندی تێر نەدەبوو، کاتی شەوان لە تەنیاییدا زۆر لە ئەندیشە و بیر، خۆیی سەرقاڵ دەکرد و تێدەفکری و بە زۆربەی بابەتەکان بیری دەکردەوە و وڵامێکی پەیدا نەدەکرد، ئەو بیری دەکردەوە کە هەژاری لە چیەو و دەوڵەمەندی لە کوێوە دێت، سەرچاوەی ئەمانە؛ هۆکاری نابەرابەری خەڵك لە سەر چ ئەسڵ و پایەیێکە، من لێردا لە ناوی ناز و نیعمەتدا ژیان دەکەم و لە خورد و خەو و ئامرازی شکۆدار کەڵك وەردەگرم بەلام لە پشتی دیواری ئەم کاخەو خانوە

بەشکۆیە کۆمەڵێ خەڵك هەن کە بە برسیەتی و هەژاری و سەرما و بێ نەوایی دەست بەیەخەن، بۆچی من شام، بۆچی زیاتر لە هەموان قودرەت و زۆرم هەیە، مەرگ و مردن چیە؟ ئایا کاتێکە مەرگ منی رفاند و مردم دەبمە چی؟ ئایا لە دوای مەرگ دوبارە ژیان هەیە؟ ئایا ئەم پەیس و مەقام و زۆر و قودرەت و شکۆیە بۆم دەمێنێتەوە؟ ئایا کاتێکە مردم و لە گۆڕمیان نا ئەم سەرودت و سامانە و قودرەتە دەتوانن کارێکم بۆ بکەن؟ ئەو کاتەی کە تەن و بەدەنی من رزا و پوسیا و بوو بە خۆراکی کرمەکان دوای ئەوە چ پێش دێت؟ ئایا دوای مەرگ و مردن نیشانەیێك لە ژیان دەمێنێتەوە یا مەرگ پایان و دوایی هەموو شتێکە؟

ئایا لە مردندا بابەتی گوڕانکاری و جێنشینی هەیە (یانی تەناسوخ) ئایا دوای مەرگ بەشتێکی دیکە دەگۆردرێم و تەبدیل دەبم بە شتێك، ئایا بابەت و مەسەلەی تەناسوخ راستە؟ ئایا خۆم دەبم یا کامیلەن بوون و وجوودی جیاوازم دەبێ. ئەگەر ژیانێکە لە دوای ئەم ژیانە هەیە لەوێدا چ رووداوێك چاوەڕوانم دەکات؟ ئایا لە بەردەوامی ئەم ژیانەکە هەیە هەر ئەم قودرەت و زۆر و ماڵ و سامانە و جوانی و شکۆیە دەمێنێتەوە یا هەژاری و ژیانی پڕ لە مەینەت چاوەڕوانم ئەکات کە بە جۆرێك بێشەوانە جێگاێیکم نەبێ کەسەرم دانم و بخەووم؟ئایا پێش لەوەی کە ئەم ژیانەم بەم شێوە هەبێ و بێمە ئەم جیهانەوە چیم دەکرد؟ ئایا لە پێشان لەم سەر زەوی‌یە ژیانم بە سەردەبرد یا لە جێگای تردا بومە؟ ئایا بۆ هەوەڵێن جار بەم شێوە ژیانە بووم و لە دایێك بوومە؟ ژیانی ئەسلی من چۆن دەستی

پێ کردوە؟ ئەم جیهانە چۆن هەستی و بوونی پەیدا کرد و رازی ئافەرینش لە چیە؟ پێش لەوەی ئەم هەستیە دروست بێ چ شتێك بوونی هەبوە؟ ئایا بۆ هەستی و بوون ئافرێدگاری پێویستە ئایا ئافەریدگار خودایە ئەم جار خودی (خوا) چون بوونی هەبوە کە جیهانی دروست کردوە.

زەمان و کات و سات چیە، ئایا ئەمەش هەودلێکی هەیە، پێش لە زەمان چ شتێك هەبوە، ئایا ئەبەدیت تەنیا قسەو و گومانە ئەتوانێ هەستی هەبێ یا نە؟ شەوانی شاویشتاسب بەم بیرە ئازار دانە دەگوزەرا و زۆر جار تا بەیانی نەدەخەوت و خەوی لێ حەرام ببوو، هیچکام لە زانایان و حەکیمان و فیلسوفانی دەرباری شاە تەوانایی وەلامی ئەم پرسانەیان نەبوو کە باری ئەندیشە و بیری شاتۆزی ئارام و سوك کەن.

لەم رۆژانەدا بوو کە ناو و ناوبانگی زەردەشت بە بالاترین پلەی خۆی گەیشتبوو وە لە سەراسەری ولات و لە سەر زەوینەکانی دوور و نیزیکدا بیرمەندان و خوازیاران و تاسۆخان و تامەزروانی زانستی و مەعریفەت دەهاتن بۆ لای ئەم مامۆستا زانای بەرێزە، شاش لە هەموو ئەو رووداوانە ئاگادار بوو، لە ئاکامدا هاتە سەر ئەوەی کە جارێکیتر لە زەردەشت بخوازی بەم جۆرە بانگهێشتی نووسراوەی بە پەیکێك لە گەل ژمارێك لە دەرباریان و هاورا لە گەل ئەندازەییکیش زۆر لە گەوهەر و (زێڕ) ناردی بۆ زەردەشت و لە نامەکەدا نووسیبوو کە من لە کردەوەی خۆم پەشیمان بوومە، لە کاتێ کە لە گێژاوی ئەشەڤی گەنجی و خورۆش و تاسوخ بۆ زانینی راستیەکان لە تۆم گەرەك بوو (دەویست) کە لە چەند چرکەدا رازی

هەستی و بوونم و فەلسەفەی بوونم بۆ شرۆڤەکەی بەڵام ئێستا گۆردراوم و گۆڕانکاری بە سەرما هاتوە، کە ئەو شتەی کە ناگونجێ و ئیمکانی بەو جۆرە نیە و لە تۆم ناوێ بەڵام هێشتا بە توندی و داکۆکی سەخت تا سوخ و موشتاقی ناسینی رازی هەستی و بوون و فەلسەفەی بوون و چۆنیەتی هێزەکانی سورشتم وە ئەم تاسوخیە بۆ وەرگرتن و ئیدراك و زانین لە هەر وەخت و کاتێکی دیکە زیاتر لە منا بوونی هەیە، لە تۆ دەخوازم کە بێت بۆ لای من و ئەگەر ناگونجێ و ئیمکانی نیە خۆت بێت، یەکێ لە چالاکترین قوتابیەکانت کە بتوانێ لە بارەی کردارەکان و بابەتەکانی جێگای سرنج وڵام دەربێ بنێرە بۆ لام.

ویشتاسب ماوەیێك نە زۆر درێژ لە سرنجدان دا بوو سەبری کرد تا کاروانەکان و پەیکەکان (نامەبەرەکان) گەڕانەوە و وتیان زەردەشت درود و سلاوی لێ دەکردی بەلام گەنجینەکانی قەبوڵ نەکرد و ئەوانەی ناردۆتەوە، زەرتەشت پەیامی نارد بوو کە زەر و گەوهەر بۆ باخەوانێ وەکوو من سودی نیە و بە دەرد ناخوا بەڵام لە قەبوڵ کردنی کوتاڵ و پارچەکان کە سەوقات و بەخششی تێدا بەستەبەندی و جۆر کرابو سوپاس گوزارم، چونکە ئەم کوتاڵانە لە کاتەکانی سەرمای زستاندا بۆ جل و بەرگ و پۆشانی دارەکان و پارازتنی ئەوان پێویستە و کەڵکی لێ وەردەگیرێ، ئەم جار زەرتەشت سەوقاتێکی بۆ شا نارد و وتبووی بە شا بڵێن ئەمەیە مامۆستای من و زانایێکی کە هەموو شتێك دەربارەی یاساکان و سیستم و هێزەکانی سورشت و بوون و نەبوون و یا بابەتەکانی دیکە و

پەنهانیەکان و نەسراری سورشتی بە تۆ دەڵێ کە ئەگەر خیرەد[٢٧] و بینینی[٢٨] راستەقینەت هەبێ) زەردەشت وتبووی بە شا بڵێن (بێژن) کە من یەکێ لە قوتابیانی خۆم بۆ لای ئەو نانێرم بەڵکوو مامۆستاکەم بۆ کنی شا دەنێرم، چونکە ئەو شتەی کە من سەبارەت بە یاساکان و رێکی جیهان و سیستەمی هێزەکانی جیهان و رازەکانی بوون و هەستی و ژیان دەزانم لەم دانە گەنمە فێر بوومە، من پشت سوور و ئەرخم بەوەی کە شا بەو ئەندازەی کە بۆ زانینی و وەرگرتن و فێر بوون بەهر و ئامادەیە کە مامۆستاکەشی بۆ فێر کردن، براوو براوو.

شا بە سەر سوڕمان و ماقیەوە پرسی کە ئەوە کواو لە کوێدایە، مامۆستای زەردەشت؟ ئەم جار پەیام هێنەر سەوقاتێکی بچووکی کە زەردەشت ناردبووی و لە بەرگ و پارچەیێکی زۆر شەفاف و بێ ڕەنگ دا بوو بە شا پێشکەشی کرد و شابتر ماقی وڕما و (سەرسام بوو) بەرگەکەی واز کرد و لە نێوان ئەو بەرگەدا دانەی گەنمی دەست کەوت، ئەمجار بیری کردوە کە دەبێ رازێکی ئەفسون گەری و سیحر ئاوەر لەم دانە گەنمەدا بوونی هەبێ کە خۆی و هەموو زانایانی دەربارەی ناسینی ئەوە ناتەوان بوونە، لە دواییدا فەرمانی دا تا ئەم دانە گەنمە کە لە نێوان بەرگەکەدا بوو لە نێو قوتو و سەندوقی گەوهەرین دا دابنێن و لە خەزنەی شادا هەڵیگرن؛ ماوەیێك بوو شا کە چاوەڕوانی رووداوێك بوو کە دەرگای

---

٢٧ . ئەگەر خیرەد و عەقل بینی هەبێ یانێ تێ روانین عاقلانەی هەبێ

٢٨ . دین ووشەی کەڵهوری و فەیلیە.

مەعریفەت و زانینی و وەرگرتن و ناسینی بۆ بکرێتەوە. مەیوس و ناهومێد بوو، بیری دەکردەوە کە زەردەشت دەربارەی ئەو سوکایەتی و گاڵتەی کردوە و شتێکی نەوتووە، لە بیری خۆیدا دەیووت دەگونجێ زەردەشت خوی شتێك نەزانێ بەڵام رق و کینەی هەستابوو ووتی: دەبێ بە ئەو نیشان بدەم کە بێ کومەك و یاری ئەو لە ئاکامدا [29] (دەرئەنجام) بەو شتەی کە دەمەوێ بگەم و دەستی پێ پەیدا کەم. براوو، براوو، براوو بەکۆ براوو...

لەم سەردەمانەدا زاناییکی گەورە فیلسوفێ کی بێ وێنە لە پەنای سەر زەوینی هێندا ژیانی بەسەر دەبرد (هەبوو) بەناوی چینگرەنگها چەکە بەناوبانگی لە هەموو جێگا و ولاتدا هەبوو، شا وتی: هەر ئەو کاروانە و گەنجینە پڕ بەهاو گران قیمەتانە بۆ زەردەشتی ناردبوو بۆ ئەو زانای هێندیە بنێرن و لێ بخوازن کە بێت بۆ بارگای ئەو و ببتە مامۆستای [30] ماوەییێك درێژ و چەند مانگێ گوزەرا (رابورد) دەرئەنجام رویشتووان و کاروانەکە هاتنەوە و پەیامیان هێنا (هاورد) کە شا بە شادمان بێ چونکە چینگرەنگها چە زانای هیندی قەبوڵ و وەرەی کردووە کە بە خزمەتی شا بگات و ببێتە مامۆستای ویشتاسب شا، زۆر شادمان و خۆشحاڵ بوو و فەرمووی لە کاتی هاتنی فیسلوفی گەورە، شارەکە جوان کەن و بیرازێننەوە و جێژنێکی گەورەی بۆ ئامادە کەن و هەمووان شادمان

٢٩. قوتو و وشەییکی رەسەنی کوردیە یانی جەعبە.

٣٠. (کورت کراوە ببێتە).

بن، کاتێ کە زانای هیند هاتو واریدی شاربوو پاوشا لەو سپاسی کرد کە بۆ مامۆستایی ئەو هەموو رێگای درێژەی بڕیوە و هاتوتە پێ‌تەخت چینگرەنگها چە بە شای ووت: کە هوو مایەی فورت و ئیفتیخاری منە کە مامۆستای تۆ بم. بەلاّم پێویستە رۆشن و شەفاف و بێ‌پەردە بلێم کە زیاتر هاتم بو ئێرە و سەفەر کردنم بە خاتیری ئەوەیە کە زەردەشت ببینم و مولاقاتی کەم (پێ بگەم) چونکە لە بارەی ئەو شتێ زورم بیستوە (ژنەفتگمە)، بەراستی نازانم کە ئایا چلۆن بە بوونی من نیازە، لە کاتێکا مامۆستاییێکی گەورە لە نیزیکی ئێوەدایە (زیندەگی ئەکات) کە توانایی هەیە لە بارەی زۆر شتەکان کە ئێوە ئاگادار کات (فێرتان کات) شا وتی: ویستم کە زەردەشت من ئاگادار کات و دوو جار لەو خوازیار بووم بەلاّم ئەو بۆ من دانەی گەنمی نارد کە هەموو رازی ژیان (حەیات) بوون وجودی نیروویەکان (هێزەکان)ی سورشت لەم دانە گەنمە دایە ئایا ئەم جۆرە بابەتە پێکەنین هاودر نیە، مامۆستاییێکی گەورە و زانایێکی وەك تۆ (پسەوتوی) چلۆن دەتوانێ ئەم کارە بنوێنە و توجیهی کا؟ دوایی شا، دەری سەندوقە (قوتووە) بچکۆلە زەرینەکەی کە دانە گەنمێ‌کی (تێدا) بوو واز کرد (ئاولێ کرد) و لە لای زانایی هیندی دای نا، چینگرەنگهاچەش قوتووەکەی باز کرد (وازش کەرد و بازی کرد) هەورامی و ئەردەلانیە) ماوەیێکی درێژ و توولانی بە بیرەوە بە دانە گەنمەکەی روانی لەم کاتە و ماوەیەدا بێدەنگی قولوو تەواو (نەطەواو)[٣١]

٣١ . بە داخەوە کوردی باشوور زۆربە جێگای تەواو دەڵێن طەواو کە زۆر هەڵەیە.

به سەر تالاری کاخدا سێبەری فەرمانرەوا بوو، ئەو جارە زانای هینـدی سەری هەڵهێنا و وتی ئەوەتا من هەست دەکەم کە لە ئەم سەفەرە درێژەم رازی[٣٢] و تەسەل و پێشاوم، چونکو بەراستی زەردەشت زانـا و مامۆسـتای گەورە و بێ وێنە و بێ هەمتایە (هاووێنەی نیە) بۆ ئەوەی زەرتەشـت لـە راستیدا مامۆستای خویی ناردۆتە لای تـۆ، ئـەم دانـەی گەنـە دەتـوانێ رازەکانی ژیان و هێزەکانی سورشتی و رێکایەتی و سیستەمی جیهان بـە تۆ فێر کات. چونکە هەموو ئەمانە لە دەروونـی خـۆی گرتـوە تـۆ ئـەی پاوشا ئەگەر بەراستی بە دوایی گەڕان (مڵ و موش (کوردی) جوستوجو (هەر کوردی) و جۆیای وەڵامی پرسەکان کە بـۆت حـەڵ نـەبوو نـەو لـە ئیبهام و تاریکی و سـەر دەرگومیـدا ببوایـەت ئـەم دانـە گەنـەت لـە قوتوێکی زەرینی وەهادا نیگاداری نەدەکرد، هـەر کـات ئـەم دانـە لـە زوینێ کا کە پێوەندی بەو هەیە بچێنرێ و دوایی بڕوێت و سـەوز بـێ لـە ئاسەواری بەرهەمی لە خـاکدا، هـەواو و کـەش، بـاران و خـۆر (وەر) و نووری مانگ و ئەستێرەکانە هەر وەها جیهانێك لە دەروونی دا بە گەشەو بلاو بوونە دەڕوات و هەموو هێزکانی بوونەوەر لە سورشـتدا بـەلای ئـەو دەچن و دانەکە لە ژینگەی چالاکانەی خۆیدا ئەو هێزانە کەسب دەکـات و بۆ لای خۆی رای دەکێشێ و بە شێوەی دانەکانی فراوانی زایندە و پـر لـە ژیان دەبێ، هەر بەو وێنەیە دەبێ وێنەی تۆ (میسالی تو) تا کاتێکە لـە ناو کاخی درگای داخراودا ژیان ئەکەی، بوونت وەکـوو دانـەی گەنمـە لـە

٣٢ . داخی عارەبی.

قوتوی زەریندا بێ، هەر کاتێ کە دەتەوێ بە زانایی و ئیدراك و تێگەیشتن بگەیت پێویستە وەك ئەم دانەی گەنمە کاخی دروست کراو بەجێ بهێڵی (و تەرکی کەی) و لە ژینگەیێکی بەهر و (موساعید) ژیان بەسەر بەری، دەبێ بچێ بۆ ناو باخ و بەردو باخ روکەی کە جێگاییێك کە بە سورشت نیزیك بێ و پەردە (حیجاب) لە نێوان سورشت و هێزەکانی ئەو لە گەڵ تۆدا بوونی نەبێ (نەمێنی) لەوێدا بە سورشت و ردوان و روحی جیهان و هێزەکانی ئەو نیزیك دەبێتەوە و ئەم هێزانە ئەوەندە لە دڵی خاکدا بەلای دانەێك گەنمە دا دەڕۆن و هاشاوڵ دەبن بە تسوش رو دەکەن و دێن بۆ لات تا ئەو جێگایە لە گەڵ سورشت و جیهانی زیندوو چالاکدا دەبنە یەکێ «ئەو کات هەموو رازەکانی سورشت بۆت ئاشکرا دەبێ بۆ وەی خۆت بویتە بەشێك لەو هێزانە و رازانە (وەرگێڕ) زەردەشت خۆشی سورشت بووە، بەلاّم تۆ بێ‌ئەندیشە و داچون لە بیردا و درەنگ کردن بابەتێکی ئاوە هات وەرگرتوە، هەر کات بە چاوەروانی گەشەی ئەم گەنمە دانیشی دەزانێ کە هێزەکانی پایان نەبوون و لە دوایی نەهاتوو و سەر سووڕ هێنەر لەوەدا بوونی هەیە و پڕە لە هێزەکانی زایندەی ژیان (هێزەکانی ژیان ئاوەر هاودر) چونکە باش بڕوانی دەبینی کە دانەیێك خۆی نیست و نابود دەبێ و لەبەین دەچێ و بەرگ و گوڵی لێ دێتە دەر و دەڕوێ لە دڵی خاکەکەدا بە سەر هەموو ئاستەنگەکان و بەرگرەکان (مەوانیع) پیرۆز دەبێ، ئەم دانەی گەنمە گۆڕانکاری بە سەر وێنەکەیدا دێت لقەکان و پەل و پۆکانی دەگۆڕدرێ و گەورە و گەورەتر دەبێ دەزانی

بۆچی و لەبەرچی؟ چونکە هێزی ژیانی پڕی هەیە و لە دەروونددا زینـدوە، هەرکات بەردێك لە نێوی خاکدا پەنهان کەی و یا بە هـەوا پـەرتی کـەی هیچ رووداوێك یا هیچ گەشە پیٚدانی روناداوەد کەویتەوە سەرزەوین و بێ بزاو و بێ حەرەکەت دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی مردوە و گیانی لە بەردانیـە و ژیان لەودا بوونی نیە وە ئەو هێزانەی ژیان هاوەر کە لە دەروونی دانەکەدا بوونی هەیە و دەبێتە گەشە پیٚدانی، ئەوە لە بەردەکەدا نیـە، کـاتێ کـە گیایەك جوانـەیێکی (چـوزەی گیـا) لـێ دەروێ و دوای بـە سـاقەیێك و شکوفە و گوڵ تەبدیل دەبێ (دەگۆڕری) ئەمە ئازاد بوونی هێزەکانی ژیانە لەودا، ئەمە پیرۆزیە (ناجیح بوونە) پیروزی بـە سـەر مـەرگ و نـەمان و راویستاندا و لە راستیدا گیا و ساقە و پایەکەی لە هەر ساتێکا لە گەشە و زیاد بوونی خۆی بەلاییەنی رووناکی و خۆردا سەردەکێشێ و دەروانێ وە لە گەڵ هێزەکانی گەندەل و نابوود و نیست کارا خەبات و موبارزە و شەڕ دەکا بۆ سەر هەڵدان (لە وەرگێڕ) پاوشا کە باش لە وتـەکانی ئـەو گـوێی گرت و بەیانەکانی زانای هێندی بیست (ژنەفت، ژنەوت ئەژنی) لە دوای ماوەیێك بیر کردنەوە و دەرەنگ کردن [٣٣] و تامـڵ وتـی: هـەر چـێکت وت راستە و دروستە بەلاّم بەم جـۆرە کـە تـۆ دەڵـێ سـەر ئـەنجام گیاکـەش پەژموردە و سیس دەبێ و دەچێتە نێوی خاکدا و نیـست و نـابوود دەبـێ بەرهەم و بێ سەمەر دەبێ (بوونی نامێنی ودرگێڕ) ئەمجار ئـەو حـەکیم و فیلسوفی ناودارە وتی: ئـەری، خـۆی پـەژموردە و سـیس و وشـك دەبـێ

٣٣ . تامل - تەمول - تامل.

دەچێتە نێوی سینە خاکدا بەلاّم پێش لەوەی خیلقەت و ئافەرینشی ئەنجام داوە و خۆی بە سەدان دانە گۆڕیوە و سەدان دانەی لیّ بودتەوە کە هەر یەك وەکوو دانەی هەوەڵە و لە راستیدا ژیان و گەشانەوە و بزووتنەوەی ئەو دانە، خۆی سەدان بەرامبەر کردووە و گەشەی پیّ داوە ئەمە دەبیّ وەکوو تۆ بیّ (هاو وێنەی تۆیە) تۆ هەم هەر وەکوو ئەو گەشە دەکەی و زیاد دەبی، تۆ دەبی بوونت بەشتێك و یا کەسیّتر بگۆڕی و تەبدیلی کەی و بارەودر و زیندوو هێنەر بیّ کە ئەم گۆڕانگاریە زور قوولّتر و گەورەترە، چونکە دانەی گەنم کە گۆڕانکاری بەسەریا دێت و تەغییر شکلّ و وێنە ددا، بەلاّم هیچ کات نابوود نابیّ و بوونی بەردەوامە، بەلّکوو بە سەدان دانەی دیکە گۆڕدراوە، ئەم قانون و یاسایە ئەزەلی و بەردەوامە کە زانین و ئیدراکی ئەم یاسایە زۆر پێویستە و بەرهاودرە (سەمەری هەیە) ژیان و بزاڤ هەمیشە ژیان و بزاویّ تروراستی دەهێنیّ، هەمیشە راستیەکانی زورتر و دانەی زۆر، هەموو کات دانەکان زیاتر دروست دەکات وبەردەوامە هەر وەهایە، جا ئەگەر راستیت دەویّ و دەبیّ بزانی و زانیاریت هەبیّ وەکوو رۆڵە بزانی ئەمە بزانە تا زیاتر وەر جە گشت بزانی، دانە گەنێك بکە بە پایەی روانین و زانین یا بە ناوکی هەشتالۆو (قۆخ) و شێلانە (قەیسی) و مێویش بڕوانە تا بزانی ژیان چەند جوانە، لە خەو هەستە، زیندوو بە بیخوێنەو بە وردی بڕوانە بۆ ئەم کێوانە جوانەی کوردستانە تا بزانی نیاکان و پیشینیانی ئێمە و ئێوە چیان کردوە بۆ ئەم کوردستانە، دەست لە گەندەڵی هەڵگرن خزمینە مەبنە دارە دەستی

بێگانە، خۆتان مات مەدەن بۆ دزینی پارە و پوڵ بە درۆ کتێب بە ناوتان نەنووسن، ئەو تەماکارانە، خۆتان بە زل بزانن و ئیفتخار کەن کەشت دەزانین کە ئەوەش بۆتانی نووسیوە، خۆی زۆر نەزانە وەك بەردی عارەبەکانە تۆزێ بیرکەنەوە لە باپیرە گەورەتان گوشتاسب شا کە هەموو کات لە بیری فێر بووندا بوە پادشا بوە و ئەو هەموو پرسیارانەی هێناوەتە گۆڕێ کە تازە لامارك و داروین و ئیسپینوزا و دکارت و کانت و هێگل و مارکس و فویر باخ، ولتر و ابن خلدون و نیچە و سەدان زانای دیکە هەریەك تۆزێکی لێ دەزانی کە ئەوکات زەردەشتی پەیامبەری ئێوە ئەم هەموو زانایە هەبووە کە ئێستا برێك لەو ووشك مێشکانە و لەو گەندەل مێشکانە بە خوێندنی چەند کتێبی بێگانە هەر خەریکی گەندەلی فەرهەنگی و نۆکەری بێگانە دەکەنو چاویان بڕاوی نادا کە دەسەلاتدارەکەی خۆیان ببینن. بە درۆ و دەلەسە بە قسەی پیرەژنان و دواکەوتوان خەلکی ساویلکە هەلّ دەخەلەتێنن و بە درۆ خۆیان بە زل دەزانن و دلسۆزی بۆ ولاتەکەیان ناکەن، قسەی زۆرم لە دەرون دایە بەلام دەرفەت نیە بیژم و بیٚ ویژم.

(وەرگێڕ)

هەر وەها ئەگەر ئەتەوێ لەم پلە و مەقامانە دابێت، ئەبێ خۆبینی (خۆ بە زل زان)، خۆ بوون (بلێ تەنیا من هەم) وە من لە بیر بەری و فەراموشی کەی، دەبێ تا بتوانی لە لایەن بیر و گرتنی خرەد و عەقلانی

توانا و تەوانگەر بی وە ئەمە وەلآمێکە بە یەکێ لە پرسەکانی تۆ کە بە هۆی ئەم دانە گەنمە بەیان دەکرێت، دا چون و قـولێ تـێ روانـین لـە سـەر گوزەشت و رابوردووی ئەم دانە گەنمە بە ئادەمی و مرۆڤ نیشان دەدا کـە هەموو شتێك لە دۆخی بزاڤ و بزوتنەوە و حەرکەت دایە و هەمیـشە لـە درێژایی ئەم بزووتنەوە و گەشەدا گۆڕانکاری و دیگەرگۆنی پـێش دێـت، ژیان و هەموو هەستی و بوون لە ئاکـامی کێـشمەکێش و دژایـەتی و دژ یەك بوون لە نێوان هێزەکانی ئەرینی و نائەرێنی (ئەدار و نادار موسبەت و مەنفی) دا پێك دێت و شکڵ دەگرێ، هەر کـات و سـات بـە پانتـایی دەشت و دەر بڕوانی و بە زەوینەکانی کێڵگە و لە ژێر کشت بڕوانی و بـە سورشت بە وردی بڕوانی و ورد بیتەوە و بە چۆنیەتی با و بۆران و نـوور و ئاسمان و ئەستێرەکان باش بڕوانی زۆر لەشتان فێر دەبێ کە هەر ئەوەیـە و هەمان شتە کە زەردەشت وتویەتی: دانەی گەنم لـە راسـتیدا خـۆی یـەك مامۆستای گەورەیە، من یەك حەکیم و فیلسۆفم وە تۆ یەك پاوشا، دەبێ سپاسی زەردەشت بکەین کە دانەیێك گـەنمی بـۆ لای تـۆ نـاردووە، ئـەی پادشای گەورە من لە سەر ئەوەم کە ئەمڕۆ ئاسـوودە بـین و ئیـستراحەت بکەین و بحەوینەوە و سبەینێ بۆ لای زەردەشت سەفەر کەین، بـۆ ئـەوەی کە ئەو شت گەلی زۆرمان پێ فێر کات، ئەو توانایی هەیە کە ئەو شـتەی کە جێ خوازی تۆیە بە تۆی فێر کات وە لە گرانباری ئەندیشە و بیرەکانی تۆ کە بێ شرۆڤەن و شی نەکراونەتەوە و رەوانت ئازار دەدا نەجاتت بـدا و رەهائیت پێ ببخشێ و منیش لە زانستی و زانایی ئـەو بـەهرە دەگـرم و

باروەر دەبەم، وتەکانی چینگرەنگهاچە لە پاوشادا (ویشتاسب) زۆر شوێن دانەر بوو و لە رووی خواز و تاسوخی پێشنیاری فیلسوفی قەبوڵ کـرد لـە دوایی‌دا لە کاتی دیاری کراودا کاروانێ کە لە پێشی ئەودا پاوشا و زانای هێند کە هەرد و سـواری ئەسـب بـوون بـە... بـاخ و جێگـا و مـەکانی زەردەشت وەرێ کەوتن، چەند رۆژێك رێگایان بری تا دەرئەنجام گەیـشتنە باخی زەردهشت، ئەمەتە کە شا رازی دانە گەنمەکەی فێر بووبوو زانیبووی و زانای هێندیش رەوشتی زەردەشتی بۆی ئاشنا و روون بـووەوە بـە راز و رەمزی فێر کردن و ئاموزشـی زەردەشـت ئاگـادار بـوو، تـەنیا کتـێبی زەردەشت کتێبی گەورەی سورشت بوو کە رەوەشی موتاڵەعەی ئەو و فێر بوونی بە قوتابیەکانی فێر دەکرد.

دوو فەرزانە مەرد (پیاو) شاە (ویشتاسب) و چینگرەنگهاچە لە کناری قوتابیانی دیکـەی زەردەشـت بـە فێـر بـوون و موتالەعـە (دواخوێنـدن) دەستیان پێ کرد بەلاّم ئەوان راستێکی گەوردەش دەستیان کەوت و ئەوەش ئەمە بوو کە ژیان و کار، دوا خوێندن و فەراغەت هەموو وەك یـەك وان و یەك رواڵ و یەکسانن وە یەکێ لە دیکە جوی نیە و شـێوەی دروسـتی ژیان، ژین کردن لە باووشی سورشتدا و سادەگی دەبێتە هۆی پێك هاتنی ژیانێکی پڕسوود و پڕ سەمەر و پڕ لـە بزاڤـ و حەرەکـەت و ئیـدراك و فێربوون.

لەدواییدا ئەم دوو کەسە بۆ ماوەی یەکساڵ لە باخی زەردەشتدا مانەوە و رازی ئافەرینش و بابەتەکانی هەسـتی و بـوون و بابـەتی بـوونیش لـە

کتێبی گەورەی سورشتدا دووبارە خوێندن و موتالەعەیان کرد (لە سەر ئەم شێوەی ژیان و بابەتەکانی سورشتیە و زانستیەی کە فریدریك ویلهلم نیچەی ئاڵمانی کتێبی چنین گفت زەردەشت نووسیوە و باشتر لە کتێبانی زانایانی ئوروپایی نیشانی داوە و زۆر شت گەلی دیکەی فێری بوونی نووسیوە) کە هەڵبەت دوای رابوردوی یەکساڵ پاوشا بە بەلخ تەختگای خۆی (پاتەختی خۆی) گەڕایەوە و لە زەردەشتی ویست و خواهیشی لێ کرد کە کورتەیێك لە تەعلیمات فێر کردەکانی لە کتێبێكدا کۆیکاتەوە و بینووسێ ئاکامی ئەم دەرخواست و خواهیشە فەراهەم و ئامادە کرا بو بە کتێبی پیروز و موقەدەسی زەند ئاوێستا (زەند ئاڤێستا) کە بە فەرمانی ویشتاسب، دینی زەردەشتی گەورە بوو بە ئایین فرمی و رەسمی ئیمپراتوری ویشتاسب بەلاّم چینگرەنگها چەلەوێ وە بۆ هیندوستان گەڕایەوە و وەکو شاعیرێکی بە ئەزمون و فیسلوفێکی چیرە و پیروز کە ئەو شتانەی کە لە مەحەزەری وانەی زەردەشتدا خوێند بو و فێر بوبو؟ کورتی کردەوە،کورتەی ئەوانە بە شێوەی سرودگەلێ دەرهێنا کە هەر ئەو سرودانە زۆر بەرفراوان و جوان و قوڵ بوون بە ناوی ریگ وێدا (ریگ ڤیدا) کە یەکێکە لە گەورەترین کتێبانی موقەددەسی سەرزەوینی رۆژ هەلاّت (وەرگێڕ: بەم بۆنەوە نووسیومە کە ئاڤێستا سەرچاوەی زبانی کوردی و زبانی سەنسکریت و ریك ڤیدا) یە بە بۆنەی ئەم رووداوە کە پێكهێنەری زەردەشت بووە خەڵکی ئێرانە (کوردە وەرگێڕ[٣٤]) ئێرانییە.

---

٣٤ . بۆ ئەوەی کاتێ کە زەردەشت زوهووری کردوە وڵاتی ئێران ناوی ئێران نەبوو،

کورد نەتەوە و میللەتێکی گەورە و نـام ئـاوەر بـەژمار هـاتوە وە تـا کاتێکە فێر کردنەکان و تەعالیمی زەردەشت بـووە و لـە رووی پـاکی لـە گەڵ هەموو سـادەگی و بـێپیرایـەگی کـاری کـردووە و بـەوەش ئیمـانی هێناوە، بەرامبەر تەعالیمی ئاڤێستا، خەڵك ژیانی سادە و سورشـتی پـڕ باریان هەبووە، هەموو کات لەبەهێز بوون دا بوونە بەڵام کاتێکە سادەگی ژیانیان خستوّتە لاوە و لە ژیـانی سورشـتی و بـێزەرق و بـەرق دووریـان کردووە و تەجەمول و جوانی و سـاختەی جێگـای ئەوانـەی گرتـوە و لـە ئاموزش و تەعلیماتی ئاڤێستا غافڵ بوونە و بەم بۆنەوە دارای سـەروەت و ماڵی ئەو کات بوونە کە تەمەڵی رووی تیان کـردوە کـە لـە پێشـاندا قودرەت و هێـزی نیزامـی تـازە نەفـەس و تـازە هەناسـە کـە بناغـە و بونیادیشی هەر لە سەر هەمان سادەیی ژین و لـە گـەڵ سورشـت دابـوەو هۆگر و مەئنوس بوونە کە بە لوتکەی بەرزایی و باڵایی گەیشتونە و بۆرو شکستیان نەخوارد، ئەرێ هەر وەهایە دەور و تەسەلسول و بـە یـەك لـە دوای یەك (توالی) لە سەردەمانی جیهاندا، لەم سەردەمانەدا بە پێویست و بێبچڕانەوە دەورەکانی گەڕان و گەردش لە سەراسەری مێژووی جیهاندا هەبوە کـە ئـەم ئـاوەز و زانینـە لـەم جـۆرە ئەزمونانـە پێـك دێـت کـە سەرنوشتی تاك یا میللەتێك هەمیشە بە بۆنـەی چـۆنیەتی پێوەنـدەکانی ئەو لـە گـەڵ سورشـت و نیزامـی جیهـان و هێزەکـان و مەتـەکانی ئـەم

---

بەڵـکوو سـەردەمی پاوشـایانی پێشدادی بـووە و دوای پاوشـاییی ئاسـتیاکی مـادی لـە سەردەمی کورش‌دا ئێران ناوی هاتوە.

جیهانەدا دابین دەکرێ وەرگێڕی لە لاپەڕەی ۸۷ تا ۹۶ کتێبی ئاڤێستا لە وەرگێڕی وتو وێژی هاشم رضی ئینتشاراتی بهجت چاپی ۱۳۸۱، تهران خیابانی ولی عصر دو راهی یوسف آباد، دوای وەرگێڕی بەشی پێشو تا لاپەرە ۹۶ ئەو کتێبە بە پێویستم زانی ئەم بەشەی دوایش لە بابەت کایەی شەترەنجدا بە ناوی (بازی شەترەنج) وەرگێڕم (لاپەڕەی ۹۷ تا ۹۹ی هەر ئەم کتێبە).

## کایەی شەترەنج

لە جلدی سێوەمدا لە کتێبی ئیدموند بێردوزکلی، ریوایەتێکی تازەی دیکە هەیە کە ئەم ریوایەتە حیکایەت لەوە دەکات کە کایەی شەترەنج پێك هێنەر و سازکەری بە زەردەشت دەگات کە هەڵبەت نە بە شێوازی کایەیکی هەرو و موتلەق بەڵکو بونیان و بناغەی لە سەر شوناسی جیهان و کەیهان و سیستەم و بناغەی هەستی و هێزەکانی سورشت و عیلمی و فەلسەفی (زانستی و پیتۆڵی) بوە، ریوایات ئەفسانەیی حیکایەت لەوە دەکات کە کایەی شەترەنج لە ئێران سەرچاوەی گرتوە، هەڵبەت دەبێ بە یاد بێنین کە هیچ بەڵگەییکی لە مێژینە و باستانی و کۆن و جێی متمانە نیە کە ئەم بابەتە بچەسپێنێ کە کایەی شەترەنج لەم سەردەمەدا ئەندیشە و بیری زەردەشت و پاوشا (ویشتاسب)ی فێری ئەم کایە کردوە، ریوایەت لەم بارەوە کە ویشتاسب، شای ئێران لە ژیان ماندوو و بێزار بوە هەیە چونکە ئەو ئارەزووی هەبوە بەو شتەی بگات و هەرکارێکی ویستویە بە ئەنجامی گەیاندبوو نە جەنگ و نە پیروزیەکانی تازە و نوێ و نە کامرانی و نە شکۆ و نە جوانی دەربار و نە شتان و نە بابەتانیتر کە ببێتە هۆی دڵبەستێکی ئەو هیچکام ئەوی تەسەل و قانیع نەدەکرد، کەسێ پیرۆز و ئازا نەبوو تا دڵبەستگی و شادمانی و هومێد لە دڵی شادا بڕوێنێ و درگای شادمانی لێ بکاتەوە و تا ئەوەی زەردەشت کایەی شەترەنجی کە پێكهێنەری بیر و هۆش و خەباتی خۆی بوو کە سازی کرد و بەو، کایەیە

کە بە شێوەی رەسەن و بێگۆڕانکاری رۆیشتە لای شا تا خەبات و موبارزە و پەیکاری هەمیشەگی و بەردەوام (لەنێوان خێر و شەڕ (چاکە و خراپ) دا کە مرۆڤێ کامڵ ئەرکی سەرشانیەتی تا دەگەڵ هەموو نیروێکدا خەبات کات، ئەگەر نە لەم مەیدانەدا جێ ژیانی بۆنیە) فێری شا بکات و راوێستان و نەبوونی بزاڤ و ناهومێدی بە مانای مەرگە و دیلی و بارمتە لە دوای ئەهریمەندایە کە زەردەشت ئەمەی بە شا فێر کردبوو، زەردەشت بە کایەی شەترەنج هەموو یاساکانی جیهان و سیستەمی سورشت و بونیات و بناغەی ژیانی بۆ شانۆگەری کردبوو، ئەو بە تەنیا ئەو جورە تەفسیر و شرۆڤەی لەم کایەدا ئەنجام داوە کە هیچ شەترەنج کارێکی وەرزیدە و ئازمون دار لەم سەردەمەی ئێمەدا ناتوانی راڤەی وەها بکات کە زەردەشت ئەم شرۆڤە و راڤە کە لەم کایە کردوەتی، شاش لەم رووداوە زۆر خۆشحاڵ و شادمان بوو کە لەو دا دڵبەستگی بە ژیان و کوشش و خەبات جارێکیتر هەستاوە و بێدار بوو، ئەو کات ویستی تا بە هەر شێوەێك بێ پاداش و دەستخۆشیەك بە زەردەشت بدات وتی ئەی زەردەشت هەر چێکت ئەوێ لە من بخوازە کە پێت دەدرێ زەردەشت هاتە سەرئەوەی تا کارێ بکات کە ببێتە هۆی سەرسوڕمانی پاشا (ویشتاسب) کە تا ئەو ئەندازە مەغروور و لەخۆرازی و بای هەوانە بێ کە هەر چێ بیەوێ تەوانایی ئەنجامی هەیە، سەرئەنجام بە شای وت شتێکی زۆر بچووك و ناقابیلی ئەوێ و ئەوەش ئەوەیە کە لە ماڵی هەوەڵی لاپەڕەی شەترەنج دا، دانە گەنمێکی بو دانن، بەم جۆرە

دوو دانە لە ماڵی دووهەم، دوبەرامبەر لە خانی سیوم (هەر وەها ئەم هەلچوونە (تصاعد) تەساعودی هێندسیە) کە دوو دەبێتە چوار چوار دەبێتە هەشت، هەشت دەبێتە ١٦ و ١٦یش دەبێتە ٣٢ تا ئاخر، بەلاّم تەساعودی عەددەدی و ژمارەیی یەك دەبێتە ٢ و ٢ دەبێتە ٣ و ٣ دەبێتە چوار و ٤ دەبێتە پێنج لە چەمکی مالتوسەوە جەماوەر بە شێوەی تەساعودی هەندسی دەچێتە سەر بەلاّم خواردەمەنیەکان بە شێوە تەساعوودی عەددەدی (وەرگێڕ) هەر وەها تا ئاخر خانەی لاپەڕە سەفحەی شەترەنج شا بەم داخوازیە ناقابیلە پێ کەنی و وتی بە زووترین کات ویستی ئەو بە ئەنجام دەبێ و گەنمەکان لە ماڵی زەردەشتدا پێ دەدرێ، لە حاڵێکدا لە دەرونیەوە بیری دەکردەوە کە لە گەڵ چ پیاوێکی سادە و ساویلکە رووبەروو بووە کە تەنیا داخوازی چەند دانە گەنم دەکات لە حاڵێکدا دەتوانێ داخوازی گەنجینەیێك لە گەوهەر و زەڕ بکات لە دوایی دا شا بە خەزنەدارەکانی فەرمان دا تا گەنمەکان بەرامبەر ویستی زەردەشت ژمارە و حەسێو کەن و بێ بەنە ماڵەوە بۆ زەردەشت، ڕۆژانی زۆر لە نیزێکی مانگێ رابورد و شا لە خزنەداری پرسی کە کارەکە چی لێ هات بەلاّم شا لەم کارە سەڕی سوڕما کاتێکە خزنەدار و هاورێکانی وتیان ئەندازە و ئاستی گەنمێك کە زەردەشت دەیەوێ بیدەینێ زیاتر لە هەموو ئەو گەنمانەیە کە لە قەڵەم رەوی شادا بوونی هەیە، شا زۆر ماقی وڕما و لە عەینی حاڵدا شەرمەندە بوو، سەرسوڕمان لە حەسێو و ژمارەی دانەگەنمەکان کە زەردەشت ئەیەوێ وە شەرمەندە لەوەی کە ناتوانێ بە

بەڵێنێکەی کە بە زەردەشت دابووی عەمەلی پێ بکات، ئەم جارە ناردیە شوێنی زەردەشت و بەوی ووت کە تەوانایی ئەنجامی بەڵێنەکەی نیە تا چەندە شەرمەندەیە، هەڵبەت ئەمە ریوایەت ئەفسانەی کۆنە لە بارەی مەنشا و بناغە و سەرچاوەی کایەی شەترەنج کە بە رۆژگارانی لەمێژینە پێوەندی هەیە بەلاّم شەترەنج ئەمڕۆ تەنیا کایە و وەخت و کات بەسەر بردن و خۆشی و سەرگەرمی‌یە، هەرچەند تا ئاستێك توانجەکان و کینایەکانی سومێری باستان هەنووکە نیشان دەدا بەلاّم وەرگێڕ کە خۆم ئیسماعیل ئیبراهیم ئەیوبیم بەو جۆرەی کە لە شانامەی مامۆستا ئەبوالقاسم فیردەوسی‌دا کە خوی کورد بوە لە لاپەڕەی ٤٥٨ تا ٤٦٥ خوێندوومە و دووبارە خوێندوومە ئەڵێ لە سەردەمی ئەنەوشیروانی ساسانی‌دا کەئەم پاوشایانەش کوردن و دایکیان لە بابەکە کە خۆی لە شوانکاردیە، برزویەی تەبیب یا بوزور جومێری پزیشکی نارد بۆ هیندوستان کە زۆر شت هەبوون کەلەوێ ئەو بۆ ئێرانی بهێنێ کە یەك لەوانە کتێبی کەلیلە و دیمەنە (کلیلە و دمنە) بوو و کایەی شەترەنجی لەوێ هێناوە و داخوازی لە ئەنوشیروان ئەوە بوو کە لە داستانەکەی زەردەشتدا وترا بەلاّم شەترەنج و کایەی شەترەنج ئەڵێ لە هیندوستاندا بووە کە دوو پاشا بوونە هەر دوو برا، یەکێ ناوی جومهور بوو کە ژنێکی زانا و بەهۆش و بیری هەبوو و ئەو شایە لە بست و ...تا مەرزی چین قەلەمڕەوی بوو، پیاوێکی زۆر زانا و عاقڵ بوو، ژنەکەشی هەر وەها وتم لە هیچێ کەمی نەبوو هونەرمەندیش بوو، دوای ماوەیێك شاژن

باردار (حامڵە) بوو و کوڕێکی بوو کەس لە باوکی جیای نەدەکردەوە، پاوشا کوڕەکەی نێو ناو بەگەو بەلاّم زۆری پێ نەچوو پاوشا نەخۆش کەوت و مرد، کوڕە بچکۆلەکە جێگای باوکی گرت ،بەلاّم پیر و گەنج و ژن و پیاو وتیان : ئەم منداڵە ناتوانێ پاوشایی کات و ولاّت زەرەری پێ دەگات،باش وایە هەموان بێنە سەر ئەوەی کە براکەی شا بە ناوی مای کە لە شاری دەنبەردا بوو هەڵی بژێرن و بیکەن بە شا، ئەوە بوو کە هەموو گەورەکانی هیندی لە سەندەل تا دەنبەر رووی هێنا و هاتنە لای مای، هەموان، گەورەکانی کشمیر تا مەرزی چین، مای یان بە شایی قەبوڵ کرد، مای بوو بە پاوشا و لە گەڵ براژنیا هیتەی کرد و براژنی لە خۆی مارە کرد و زۆر بە پەرۆش و دڵپاکیەوە گەوی برازای پەروەردە کرد و شاژنیش دەست کەمێکی لە هیچیان نەبوو بەلاّم دەبوو ئەم کارەی بکردبایە، ئەوە بۆ ئەمجاریش شاژن کە ناوی نەبراوە لە مای برای جومهوریش باردار بوو و دوای ماودیێك کوڕێکی لە میش بوو کە ناویان نا بەتەلحەند (طلحند) مای دو ساڵ دوایی نەخۆش کەوت و مرد کە گەو هەفت سالاّن و تەلحەند دوو ساڵ و دایکیان کە زۆر پارسا و ژنێکی بێوێنە بوو زۆر دوو کوڕەکەی نەسیحەت کرد کە دادگەر بن و چاك و پاك و لە گەڵ خەڵکدا بە ئارامی و راستی قسە بکەن، قسەتان بێعەمەڵ نەبێ چونکە هەر دووك پادشا زادەن دەبێ زۆر خیرەدمەند و خوش گفتو لفت بن، ئیتر فیردەوسی لەم بارەوە ئەشعاری گرانباری وتوە مەبەستەکە زۆر درێژ دەبێ کە ئەگەر راڤەی هەموو بنووسم بەلاّم ئەوەی

مەبەستە کە بگەینێ دەینووسم. ئەوە بوو هەر دوو کوڕەکە کە شازادە بوون لە یەك دایك و دوو باوك کە برا بوون وە باوکیان جومهور برای (گەورە) و مای (برابچوك) کە دوو کوڕەکەیان گەو برای گەورە و تەلحەند برای بچووك بوو کە گەو پێنج ساڵ لە تەلحەند گەورەتر بوو ئەم جار دوو شازادە گەیشتنە تەمەنی پیاوی و هەر کام بۆخۆیان ئیدعایکیان هەبوو گەو وتی: من گەورەم و باوکیشم لە باوکت گەورەتر بو، پاشایی هی منە، تەلحەند وتی: خەڵك بەمن رازین (خۆی دەی وت) دایکیان و خەڵکی زانا زۆر راوێژیان کرد و وتیان لە دەنبەر تا سەندەل خەڵك جوموریان ویستوە، کاتێکە جومور مردووە هەموان خوێن لە چاویان باریوە، ئێستا لە سەر تاج و تەخت (مەیکەن بە گاڵە مەیەکەن بە شەڕ، شەڕکاری بەتاڵە، خەڵکان دەخاتە ناڵە هەژار دەکوژرێ بە چوار ناڵە، توخوا وازبێنن لەم جیهانی حیزەلانە، ئەمانە لە خۆم (ودرگێڕ) دایکیان وتی: رۆڵە گیان شەڕ مەکەن کە دەزانن مای لە گەنجی دا جوان بەخت و بینادڵ بە سەندەڵ هاتو و هەموو سەندەلیان بە شایی قەبوڵیان کرد و منیش بوومە هاوجووتی، گەو وتی : دایە من لە ساڵ و تەمەنەدا لەو گەورە ترم و بڵێن بە تەلحەند بە نەزانی ولات تێك نەدان و بە تەلحەندی وت کە هەر چەند من لە تۆ گەورەتر و زاناترم بەلام ئەم پرسە بخەینە ئارای گەورەکان و زانایانی هیندەوە کە ئەگەر وتیان هەر کام شابێ قەبوڵی کەین بەلان تەلحەند بۆ ئەم کارە ئامادە نەبوو چونکە دەیزانی خەڵکی زانای هیند بە گەورای دەدەن هەر چەند فەرزانەکان ئەندەرز و نەسیحەتی تەلحەندیان کرد، گوێ

بۆ ڕانەگرتن و بە سەرەرووی خۆی سپاییێکی پێك هێناو، بۆ شەڕ ئامادە بوو ئەمجاریش گەو زۆر لیێ پارایەوە و پەیامبەری زۆری ناردە لای کە ئەم شەڕە بە سوودی خەڵك نیە و نابێ دوو برا، بە جێگای ئەوەی کە وڵات ئاوەدانی کەن وێرانیکەن، بەلاّم وەلاّمی تەلحەند ئەوە بوو وتی بە گەو بڵێن لە شەڕدا بەهانە نەگرێ، من بە ئەو ناڵێم برا و ناڵێم دۆست کە مێشکمان یەك نیە و هەر وەها ووتی: کە هەموو بەدئەندیشەکان و بەدنژادان (وەکوو بارام و هورموز کە ئێرانی بوون) لە لای تون، گوناح کار لە لای یەزدان توییی بەدناو و بەد گەوهەر و بەدخۆ و خەدەتویی و .... سەرئەنجام دوای باس و جەدەلی زۆر، پەیامی گەو بە تەلحەند گەیشت کە هەرچیێ گەوهەر و زەری دەویێ پیێ دەدەم، ولاّمی تەلحەند ئەوە بوو کە بە گەو بڵێن کە زوانی بسوتیێ بۆ ئەو قسە کە دەیکا، هەموو گەوهەر و زەرە و تاج و تەخت هی منە و بەس، سپای هەر دووك بە فاسڵەی دو میل لە بەرامبەریەکدا ڕاوێستا بوون و سەف ئارایی کرابوون مەیدان پڕ لە ئەسب و پیادە و فیل بەلاّم هەر دووك بە سپایەکەیان تەوسیە یان کرد کە ئەگەر کەسیێ گەیشت بە گەو یا تەلحەند نەیکوژیێ و گەو وتی ئەگەر تەلحەندیان گرت دەست بەستە بیهێنن بۆ لای من و هیچ گەزندێکی پیێ ڕاێد نەکەن، تەلحەندیش ووتی: کە ئەگەر ئێمە پیروز بویین گەو نەکوژن، لە بان پیل مەستەوە بیگرن و دەست بەستە بۆ لای من بیهێنن، ئەمە بوو هەر دوو پاوشا لە قەلبی سپا قەراریان گرت و ڕاوەستان و ڕاست و چەپ (مەیمەنە و مەیسەرە) دابین کرا مەیدانی شەڕ

شەرگە، لایێکی کێو ولاییکی دەریا بوو سپای تەلحەند بەلای دەریا داچون و زووریان خۆیانیان خستە نێوی ئاوەوە، هەر دوو پاشا فیل سوار بوون، جەنگ دەستی پێ کرد زەوین تاریك بوو، ئاسمان وەکوو بەنەفش، ئەوەندە سەرنەیزە و پەڕنیانی دەرەفش (ئالا) کەش و هەوای لە تۆز و گەردی سپادا بوو بە ئابنووس (رەنگی ئابنووس) لە نالەی بوق و کەرەنا و کۆس تۆ ئەتوت! دەریا هاتۆتە جۆش نەهەنگ لە خوێندا خرۆشان و لە زامی تەبەرزین و گورز و گۆپاڵ و تێغ لە دەریاوە پێك هاتبوو، تەم و مژێکی سوور، سپا دەهاتە پیشێ فەوج و فەوج لە دەریا دەهاتنە سەر بای مەوج لە هەموو دەشتدا، کە پڕ ببوو لە مێشك و جگەر و دڵ، هەموو نالی ئەسپان لە خوێن پڕ ببوو لە گڵ و ....

تەلحەندروانی لە پشت فیلەکەیەوە زەوی وەکوو دەریای نیلە، هەر ئەو بایە بە لایەن تەلحەند دا دەهات و سپای تەلحەندیش گەمارۆ درابوون و بە نان و بە ئاو ئاردزوومەند بوون تەلحەندلە باو خوڕەی شەمشێری تیژ نە ئارامی دیت نە رێگای گوریز (دەربازبوون) لە بان زینی فیلەکەیەوە خەوی پیاکەوت و مرد و هەموو ولاتی هێندی بە گەو سپرد. گەو کەروانی لە قەلبی سپاکەوە ئالای تەلحەندی نەدی و خەبەریان هێنا کە تەلحەند مات بوەو لە بان فیلەکەیەوە مردوو، سەرئەنجام گەو پیرۆز و تەلحەند مات و بۆردرا و مردووە، گەو زۆر ناراحەت بوو چەند رۆژێك ماتەمینی بۆ برا مەغرورەکەی دانا و دوای بە تابۆتێ لە عاج و زەر و پیرۆزە و داری ساج

یان بۆ دوروس کرد، پوشایان بە پەرەندی چینی و [٣٥] بەدبیق[٣٦] و بەقیر و بە کافور و مشك جەسەدەکەیان وشك کرد و لە تابۆتە تەنگەکیاننا، لەو کاتەوە کە دوو براکە شەڕیان دەست پێ کردبوو دایکیان خورد و خەوی لێ حەرام ببوو کاتێکە سپای پیروزی گەو گەڕایەوە، تەلحەند و فیلەکەی و ئالاکەی دیار نەبوون، ناودارانی زەرینە کەوشیش نەبوون، ئەوجار دایکی لە چاو خوێنی دەباری و خۆی غەرقی خوێن کردویە قەی دادڕی و ... لە دوایی‌دا هەموو فەرزانەکان و موبەدان بانگ کران کە هەڵبەت لە هەوەڵەوە وەکوو فەرزانە شاێك پێکەوە باسیان کرد و رووداوی شەڕەکەیان بەو جۆرەکە رووی دابوو بەیان کرد و بۆئەوەی دایکی ئارام بگرێ کە ئەم براکەی نەکوشتوە و خۆی مات بووە، ئەمە بوو سەحنەی جەنگە کە بە فیل و بەروخ و وشتر و پیادە و ئەسب لە چێو ساز کرا کە لە لایەکەوە فەرزانە وە لە لایەکترەوە شا لە دەوری دوو فیل و دوو وشتر لە پای فیلان، لە لای دوو وشتر دوو ئەسب و دوو مەرد کە نەبەرد کەن کە لە رۆژی جەنگ خەباتدا دوو روخ لە هەر دوو سەفی سپا، لە خوێنی جگەرا کەف لە لێودا، پیادە دەڕویشت بەردو دوا، کە ئەو فەریادرەسی جەنگ بوو، پیاوی فەرزانە یەك خانە دەچووە پێش کە لە گەڵ شادا لە شەڕدا نەبوو وە سێ خانەفیل سەرفراز دەرویشتە شەرگە کە لە دوو میلەوە شەرگەکەی دیت، سێ خانەی وشتر هەر وەها دەچوو پێشێ بۆ

٣٥ . ناوی کوتالێکی چینی.

٣٦ . وەکوو جەوی داروەهایە.

شەرگە هەروەها ئەسب سێ خانە، ئەو کات خانەی بێگانە بوو رۆخ کینە خوا هەر لایێك دەرۆیشت شەڕی دەکرد. تا ئەو جێگایە کە هەموو رێگایان لە شابەست، روخ و ئەسب و فەرزین و پیل و سپاه دەورەی تەلحەندیان دا و ماتیان کرد دایکی شەو و رۆژ ئەم کایەی دوو پات دەکردەوە تا ئەو رۆژەی کە مرد، ئەمە پیشەی بو وشەترەنجیش پزیشکی بوو، ئەمە بوو داستانی رووداوی سازکردنی کایەی شەترەنج بە وتەی فیردەوسی کە زۆربە کورتی هێناومە بەلاّم مامۆستا حەکیم ئەبوالقاسم فیردەوسی لەم داستانەدا وەکوو داستانەکانیتری شاکاری کردوە بەم بۆنە-وە داواییی لێ بوردن لە خۆی و لەو کەسانەی کە شانامە دەخوێنن و دەیزانن دەکەم چونکو کەمتر لە یەك دەهوم داستانەکەم نووسیوە بۆ ئەوەی تەنیا مەبەست لە ساز کردن و هێنانی کایەی شەترەنج بەیان کەم. بەلاّم ئەوەش بلێم کەبۆچی زەردەشتیەکان کایەی شەترەنجیان نیسبەت داوەتە پالّ زەردەشت بەلاّم فیردەوسی ئەلێ برزویەی تەبیب شەترەنجی لە هیندوستانەوە هێناودتە ئێران (لە سەردەمی ئەنوشیرواندا) بۆ ئەوەی دەزانین کە زۆر لە زانەیان و پاوشایان و گەورەکانی کورد لە سەردەمی کۆندا نێویان زەردەشت بووە، دەگونجێ نێوی برزویەش زەردەشت بووبێ کە فردوەسی نەیوتوە یا وتویە ولایان بردوە (حەزفیان کردوە) هەر بژین بە ساق و سلاّمەتی.

**ئیسماعیل ئەیوبی** (حکۆ ئەپرام) لە

٢٨ی خاکەلێوەی ٢٧٠٩ی کوردی = ١٣٨٨/١/٢٧ کۆچی خۆری

٢٢ رەبیع‌الثانی ١٤٣٠ – ١٤٣١ کۆچی

١٦ ئاوریل ٢٠٠٩ – ٢٠١٠ زایینی

# پێڵێزی ئەم نامیلکەیە

به قەڵەمی نووسەر لە لاپەڕەی ٢ تا لاپەڕەی ٥

١. سەرەتا لە لاپەڕەی ٧ تا ١٤

٢. ووشەی ئاویستایی، سەنسکریت کوردی کە کوردیە کە لە ریزی هەوەڵەویە لاپەڕەی ١٦ تا ١٧

٣. ژمارەکانی ئاڤێستایی و سانسکریت و کوردی بڕێک جار عارەبیش لە لاپەڕەی ١٧تا ٢٤

٤. جێ ناوەکانی ئاڤێستایی و سانسکریت و کوردی ئەمڕۆ لە لاپەڕەی ٢٥ تا ٢٧

٥. لە لاپەڕەی ٢٨ تا ٣٠ کردار

٦. ناوەکانی شتەکان و ئەندامی گیانلەبەران و بڕێک لە هاوەڵ ناو، مەتران پەیامبەر و فەریدون و کچی ئاهورایی، ژن و پیاو مەشیە و مەشیانە (ئادەم و حەوا)، بڕێک لە ژمارەکانی لە شوێنیەک، خەسوو و خەزوورە و باوە گەورد و برازا و ... لە لاپەڕەی ٣٠ تا ٧٠کە بە زمانی ئاڤێستایی و کوردی هاتوە.

٧. ناوی ئەندامانی تەن و مانای پیرشن یا فارس و شتانی پێویستی مرۆڤ و راڤەیک لە لاپەڕەی ٧٠ تا ٨٥.

٨. نێوی گیان لەبەران چ هۆڤ و چ خۆماڵی و سەئینە سیمورغ یا رەشە هەڵۆ کە نیزیکە بە ناوی سنە کە بەرامبەر وێنەی هەوایی لە رووی شاری سنە یا قەڵای حەسەن ئاوا، وێنەی رەشە هەڵۆیک

نیشان دەدا کە ئەگەر ناوی شاری ئەمڕۆی سانان دژ لە رووی ناوی سەئینە و یاسنە گیرابێ ئەوا شاری سنە زۆر کۆنە.لە لاپەڕەی ٨٥ تا ٩٢

٩. باو (وات – وات) جادوو و ئەستێرە، نوێژ و خوێن و دێو و بەگ و بەغ و خودا و مانگ و رۆژ و خشپا (شەو) و دارو و ئاندێرا و ئامرازی شەڕ، ووشەکانی کشت و کاڵ و ئامرازی کاریەوە هەورامی و یەڤەی ئاڤێستایی وە فرو وارە و و رووار و گاو و فوسیلی گاو ئەمە رێزلێنان لە گاو لە لاپەڕەی ٩٢ تا ١٠٧

١٠. ناوی سەگ و رێز لێنان لە سەگ و ناوی زەرگەری مس گەر و گەردەن بەند و زوخاڵ و پارچە، بازەرگانی، جۆری کچان و زەماوەن بە زبانی ئاڤێستایی و کوردی ئەمرۆ و نوتفە و تۆم، خراپکاری و گەنج و ژنی پاکدامەن و هەتیو و ناوی چوار گۆشە: رۆژ هەڵات و رۆژ ئاوا و ... گوێ زەوی لە لاپەڕەی ١٠٨ تا ١١٢.

١١. لە ریز ٤٢٥ پزیشکی لە سەردەمی لەمێژینە و بیماری و نەخۆشیەکان لە لاپەڕەی ١١٣ تا ١١٥ .

١٢. ناوە کۆنەکانی وولاتی ئاریایەکان (کوردەکان و هەخامەنشەکان) لە لاپەڕەی ١١٦ تا ١١٧.

١٣. راڤە و لێکۆڵینەوەیەک سەبارەت بەوەی بۆچی نووسیومە زبانی ئاڤێستا سەرچاوەی زمانی سانسکریت و کوردی ئەمڕۆیە بە بەڵگە و نووسینی پروفیسور ئیدموندبوردوزیکلی مامۆستای زانکۆی کالیفورونیا و مەبەستێک کە سەبارەت بە زەردەشت پەیامبەری کورد

و شا ویشتاسب (گوشتاسب) پاوشای پیشدادی و زانای هیندی بە ناوی چینگرەنگهاچەکە هەر دوو قوتابی زەردەشت بوونە و ١

١٤. سرودەکانی ریگ ڤیدا لە نووسینی چینگرەنگهاچە بە خۆرپەی لە وانەکانی زەردەشت و باسی هێنان و پێک هێنانی کایەی شەترەنج و مات بوونی شازادەی تەلحەند لەگەو شازادە هیندی کە هەر دوو دایکیان یەکێ بووە و باوکیان برا لە لاپەڕەی ١١٧ تا ١٤٧.

## سەرچاوەکانی ئەم نامیلکەیە جگە لە بیرەوەریەکانی خۆم لە هەرسین و لورستان و ناوچەی کرماشاندا

- مەزد یەسنا لە توێژ و نووسینی دوکتور ئوشیدەری کە هەورە تەرەشقەی ۱ و ۲م لە وەڵامیدا نووسیوەتەوە.
- ئاڤێستا (ئاوێستا) کۆنترین نووسراوەی ئێرانی (کوردی) لە مێژینە لە وەرگێران و توێژی جەنابی هاشم رەزی بە زبانی فارسی.
- کتێبی شاری رونی زەردەشت (شهر روشن زردشت) لە نووسینی دوکتور حسین وەحیدی بە زبان فارسی.
- کتێبی چنین گفت زردشت (وای وتوە زەردەشت پەیامبەری کوردان) لە کۆکردنەوەو نووسینی فریدریک ویلهم نیچەی ئاڵمانی لە وەرگێڕانی حەمید نیرنوری بە زبان فارسی.
- تاریخ ادبیات عصر ئاوێستایی (مێژووی ئەدەبیاتی سەردەمی ئاڤێستایی لە نووسینی پروفیسور عەبباس مهرین شوشتری. بە زبان فارسی.
- هەورە تەرەشقەی یەک و دوو لە نووسینی نووسەر بە زبانی کوردی.
- رێزمان و رێنووسی کورد و زباناسی لە نووسی نووسەر کە لە تاران بە زبان کوردی چاپ کراوە (لە ساڵی ۱۳۸۲ کۆچی خۆری).